یانیس ریتسووس

# قەرتاڵەیەک پڕ لە ڕۆژباش

هەڵبژاردەیەک لە شیعرەکانی یانیس ریتسووس

و. لە فارسییەوە:

**ئیسمایل ئیسمایل زادە**

**پێشکەش بە:**

دایکم، کە سوتووی بزەکانی سورمەی سۆمای دوارۆژمە.

بە بابم.. کە ژانی گشت ئێوارەیەکی دەستەنگی من بوو.

ناوی کتێب: قەرتاڵەیەك پڕ لە ڕۆژباش
نووسینی: یانیس ریتسووس
وەرگێرانی لە فارسییەوە: ئیسمایل ئیسمایل زادە
بڵاوکراوەی ئاراس – ژمارە: ٦٤٥
دەرهێنانی هونەریی ناوەوە: کارزان عەبدولحەمید
بەرگ: مریەم موتەقییان
هەڵەگری: شێرزاد فەقێ ئیسماعیل + فەرهاد ئەکبەری
سەرپەرشتیی چاپ: ئاوڕەحمانی حاجی مەحموود
چاپی یەکەم، هەولێر – ٢٠٠٧
لە کتێبخانەی گشتیی هەولێر ژمارە (٩٥٧)ی ساڵی ٢٠٠٧ی دراوەتێ
:

# ئاوێتەبوونی کابووس و ڕاستەقینە

*خوێندنەوەی شیعرێکی یانیس ریتسووس*

*ئەحمەد پووری*

*دیمەن:*

ژنی خەمبار لە ڕێڕەودا راوەستا، وەکیل، نیگابان.

لەسەر عەرزی، پەتووەکان تەنافیان تێ ئالاوە

لە ژووری بەرامبەر، تەلەفونی بەرامبەر، زەنگ لێ دەدا،

گوتیان: *سەعات چوار، گەمی.*

*سەعات چواری تەواو*

دەرکەی ئاسنی دیسان نالاندی

چەند کەسی تریان هێنایە ژوورێ، ژنەکە گوتی:

*جگەرەتان بۆ دێنم،*

نیگابان گوتی:

*بەسە.*

لەسەر دیوار جالْجالۆکەیەکی گەورە هەڵکشا.

لە ناکاو دەرکەی دووەم ئاوەڵا بوو.

تەرمی پیاوێك بە دەم و چاوەوە کەوتە عەرزی.

پیاوەکەی تر جالْجالۆکەکەی گرت و لە زاری خست،

پێکەنی.

بە شەویلکەی تیکپەڕیوەوە: بەسەریدا گوڕاندیان

*قسە بکە، قسە بکە*

بە هەڕەشەوە:

*قسە بکە*

چی نەدرکاند، پیکەنی.

ژنەکە لەسەر پەتۆکان دانیشت. سەری خستە نێو دەستییەوە.

(لە کتێبی *هەموو شتێك ڕازە*)

بەشێکی زۆر لە شیعرەکانی ریستووس بەشێوەیەکی سووریالیستانە باسی دیمەنەکانی ژیانی ڕۆژانە دەکەن. لەم شیعرانەدا خەون و کابووس تیکەڵ بە ڕاستەقینە دەبن و شیعرەکە پێش ئەوەی باسی واتا بکات، جۆرێك فەزای تایبەتی دەخوڵقێنێ و خوێنەر لەواندا ئەو شتانە دەبینێ کە ڕوودەدەن. شیعری دیمەن لە کۆی *هەموو شتێك ڕازە* کە نووسەری ئەم بابەتە وەری گێڕاوەتەوە سەر زمانی فارسی، دەتوانێ یەکێك لە نموونەکانی شیعری ریتسووس بێ.

*شیعرەکە بەم دوو ڕستەیە دەست پێ دەکات:*

ژنی خەمبار *لە ڕێڕەو ڕاوەستا*، وەکیل، نیگابان.

لەسەر عەرزی، پەتووەکان تەنافیان تێ ئالاوە.

زەینی خوینەر دەستبەجێ بەرەو دادگا و گرتووخانە و زیندان دەڕوا. لە ڕاستیدا ریتسووس بە توانای تایبەتی خۆی دەرکەی فەزایەك دەکاتەوە کە دەیەوێ بیخوڵقێنێ.

لە ڕستەی یەکەمدا کرداری *ڕاوەستا*، باسی شیعرێکی گێڕانەوە دەکا. بەڵام ریتسووس هەر بەو جۆرەی کە لە لە شیعرەکانی دیکەیدا نیشانی دەدا مەبەستی ئەو شیعرە گێڕانەوە باوە نییە کە تێیدا ڕووداوێك بە پێی ریزی زەمانیی تایبەت ڕوودەدا. ئەوە بە ڕستەیەکی گێڕانەوەیی شیعرەکەی

خۆی دەست پێدەکا، دواتر دەستبەجێ بە وێنەی کورت و درێژ و خێرا خێرا وەسفی خۆی دەردەخا.

لە ڕاستیدا خوێنەر کاتی تێگەیین لە وێنەکان بە خێرایی دەگاتە فەزایەك کە تێیدا خەریکە ڕووداوێك دەقەومێ. لە نێو ئەم فەزایەدا باشتر درك بەم ڕووداوە دەکرێ و زیاتر هەست پێدەکرێ. لە شیعری دیمەندا ژنێك وادیارە بە هێنانی پەتۆ بۆ ئەو شوێنە دەکرێ هاتبێتە دیداری یەکێك لە زیندانییەکان کە لەناو ڕێڕەودا چاوەڕوانە. ڕێڕەو چەندین ژووری لەسەرە و لە هەرکام لەو ژوورانەدا لێکۆڵینەوە لەگەڵ کەسێك دەکەن. دەرکەی یەکێك لەم ژوورانە دەکرێتەوە. زیندانی وەها ئەشکەنجە کراوە کە ناتوانێ لەسەر پێ ڕاوەستێ و وەکو تەرمێك دەکەوێتە سەر عەرزی. جاڵجاڵۆکەیەك بە کەم هێزییەوە سەردەکەوێ (بوونی تەرم و ناڵەناڵ و جاڵجاڵۆکەی سەر دیوار، بە ڕادەی پێویست فەزایەی سامناکی ڕێڕەوی گرتووخانە یان ڕەنگە زیندان، وێنا بکا). پیاوێکی تر دێتە دەرێ، وادیارە نەیانتوانیوە وەقسەی بێنن. پیاوەکە دەست دەبا و بە پێکەنینەوە جاڵجاڵۆکەی سەر دیوارەکە دەخاتە دەمیەوە. بەم جۆرە نیشانی دەدا کە نایەوێ قسە بکا.

دەنگی *قسەبکە*، *قسەبکە* ی یەکێك لە لێکۆڵەرەوان بەرزبووەتەوە. شاعیر پێویستییەك نابینی ئەو نیشان بدا. ئیتر باسی وردەکارییە کانی ئەشکەنجە ناکا، چونکە هەر بەم چەند رستەیە فەزای سەرسامی ئەوێی نواندووە. ژنی سەرسووڕماو لەم دیمەنە، توانای ڕاوەستانی نییە. لەسەر پەتۆکان دادەنیشێ و سەری دەخاتە نێو دەستەکانیەوە. ئەمە تازە دەبێتە خاڵی دەسپێکی خوێنەر هەتا لە ئەشکەنجە و ئازاری مرۆڤەکان و هۆکارەکانی بیر بکاتەوە و...

## پۆلاینێك لە سەدەی بیستەمدا

حامید سەفایی تەبار

شیوکەر مەنجەڵەکانی بەجێهێشت

بۆ تێرکردنی چۆلەکەیەك

بەلام ئاواز کورتخایەنە

مردووە،

دەیباتە ژێرخانەوە

ئێمە لەسەر پاکەتی جگەرەکان

بە پەلە ژمارەکان ڕەش دەکەینەوە

کە نیشاندەری هیچ شتێك نین

+، -

+، -

بەلام هەروا کە

*دەیژمێرێ و دەیژمێرێ*

*سەرەنجام دەتوانی خۆت لە گریان لادەی*

*ئاشیل*، قارەمانی ئیلیاد، شەڕکەرێکی پۆلایینە کە باوکی *پێلێ*، پاشای قەومی میرمیدون و دایکی *تێتیس*، خودای دەریاکانە. بەم جۆرە ئاشیل بەشێکی لە ئینسانە و بەشەکەی تری لە خوداکانی ئۆلەمپ-ە. ئەخلاقی هەستیار و ناسك و هەروەها هێز و دەسەلاتی ئەو بۆ شەڕکردن، کەسایەتییەك لە ئیلیاد شاکاری هۆمێر- دەخولقێنێ کە خاوەنی دوو سیمای جیاوازە. بەشێك لە نەرمونیانی خوداژنی دەریاکانی پێ براوە و هێز و یارمەتی لێ وەردەگرێ بەشەکەی تری تووڕەو تۆسن و قین لە دڵە کە بیر هێنەرەوەی رۆحە ئینسانییەکەیەتی. بەڵام تەنیا دوای تێپەڕینی هەزاران ساڵ یۆنان نموونەی ئاشیل- ێکی دیکەی ئەزموون کرد.

*یانیس ریتسووس*، شاعیر و ئازادیخوازی یۆنانی دەیان ساڵ لەگەڵ حکومەتە سەرکوتکەرەکان بەر بەرەکانێی دەکرد و زیاتر لەو ماوەیەش خەریکی شیعربوو. *ریتسووس* هەم چالاکی سیاسی بوو و هەم خاوەنی دەسەلاتێکی بێ وێنە بوو، بۆ خولقاندنی شیعر. ڕەنگە بتوانرێ بگوترێ کە باوکی بەرخودان و دایکی شیعر بوو. لە ئامێزی شیعردا ئاهۆن دەبووەوە و فەزای حاکمە سیاسییەکانی هانی دەدا بۆ بەربەرەکانێ کردن و شیعر چەکی دەستی ئەو بوو. رەنگە لەبەر ئەمە بوو کە لە پێشدا کتێبەکانیان لێ قەدەغە دەکرد و دەیانسووتاندن و دواتر رەوانەی زیندان یان شاربەدەریان دەکرد. *ڕیتسووس* لە ساڵی ۱۹۰۹دا لە دایك بوو. نەخۆشی زەردوویی و کەوتن لە نەخۆشخانە دەرفەتێکی بۆ ڕەخساند تا بۆ ماوەی چەند ساڵێك خەریکی ئەدەبیات بێ. لە یۆنان لەگەڵ دەسپێکی چاخی دیکتاتۆریی *متاکزاس*، نووسەران و ئۆپۆزۆسیون و کرێکاران کەوتنە ژێر

چاودێرییەوە و ژیانی *ڕیتسووس*– یش هەر لەم سەردەمایەدا واتا لە ساڵانی١٩٣٥و ١٩٣٦ دەست پێ دەکات. لە وڵاتێکی وەك یۆنان و بۆ مرۆڤێك وەك ریتسووس کە کوڕە جوتیارێکە و گوندییە، یەکەم لایەنگری سیاسیی ئەو، لایەنگرییەکی چەپخوازانەیە. بەم جۆرە سەیر نییە کاتێ ئەو وەکو دژی رژێمی دیکتاتۆری ئەم ڕۆژەڤە بۆ خەبات هەڵدەبژێرێ. لە ماوەی ژیانی *ریتسووسدا* بیری چەپ بیر و باوەڕی ئەو پێك دێنێ و شیعرەکانیشی بە شێوەیەکی تۆکمە پەیوەستن بە هەستی سوسیالیستی و نەتەوە خوازییەوە. *ریتسووس* لە ئەدەبیاتی سەدەی بیستەمدا لە ریزی کەسانێکی وەك نرۆدا و نازم حیکمەت دابوو کە توانییان خێڵی گەورەی بەڵێنی کۆمەڵایەتی پێك بێنن: لە راستیدا کە لۆکاچ لە سەرەتای ئەم سەدەیەدا توانیی بنچینەیەکی زیندوو دابڕێژێ و هەروەها سیستەمێکی پتەوی لە فەلسەفەی هیگلی بۆ *هشیاریی چینایەتی* دروست بکات، *ڕیتسووس*–یش توانیی بە لووتکە و بەو پەڕی خۆیی گەیاند. ئەم لووتکەیە کاتێ بایەخی دەبێت کە بەرهەمەکەی نەك وەك ڕاگەیانراوێکی سیاسی پڕ بێ لە دروشم، بەڵکو زاتی بەرهەمەکە پڕ بێ لە جوانیی داهێنەرانە، بەمجۆرە کەسێك وەکو *لویی ئاراگۆن*، *ریتسووسی* بەگەورەترین شاعیری زیندوو دانا، لە ماوەی ٨١ساڵ ژیانیدا ١٩٠٩–١٩٩٠ زیاتر لە ٩٠ کتێبی چاپ کرد کە زۆربەیان شیعر بوون. بەمجۆرە بە پڕکارترین شاعیری سەدەی بیستەم دادەنرێ. خاڵی جێی سەرنج ئەوەیە کتێبەکانی ئەو تا ساڵی ١٩٦٢ دەستیان بەسەردا گیرا و قەدەغە کران و تەنیا لەو کاتە بە دواوە بوو کە نەختە ئازادییەکی مەدەنی بواری پێدا و توانی لەگەڵ بەختی جیهانی شیعرەکانی ڕووبەڕوو بێتەوە. ریتسووس لە شیعرە درێژ و کورتەکانی و لە سەرجەم ئەزموونە شیعرییەکانیدا سەرکەوتوو بووە. ئەو بە باشی مێژوو و ئوستوورەی یۆنانی لەگەڵ بزووتنەوەی سیاسی و هونەریی سەردەمی خۆی گرێ داوە لە شوێنێکی نێوان ڕابردوو هەنووکەدا

ڕادەوەستێ و مێژووی هاوچەرخی لەگەڵ جیهانی میتافیزیك نزیك دەكاتەوە. *ڕیتسووس* لە شیعردا بە ئاسانی لە ڕیالیزم و ڕاستییە دیرۆكییەكانەوە بەرەو سووریالیزم و دۆخی بێ وێنەی شاعیرانە دەڕوا:

*ئیتر نانێكیان نییە*

*تەقەمەنییان نییە*

*تەنیا دڵیان هەیە بۆ پڕكردنی تۆپەكان!*

ئەم تەكنیكە واتە ڕۆیشتن لە ریالیزمەوە بەرەو سووریالیزم و بە پێچەوانەشەوە، لە شیعرەكانی *ڕیتسووس* دا بێ وێنەیە و لە شیعرە سیاسییەكانیدا كەمتر دەبیندرێن لە راستیدا لە دەوری دیكتاتۆریدا شیعری سیاسی زیاتر بەرەو خوازە و شاراوەیی دەڕوا. بەڵام *ریتسووس* خوازە و شاراوەیی دەكاتە فەزای شاعیرانە كە لە ریالیزمی سووریالیستیەوە بەرەو سووریالیزم و بە پێچەوانە لە سووریالیزمەوە بەرەو ریالیزم دادەبەزێ. لە تایبەتمەندییەكانی تری شیعری *ڕیتسووس* بوونی ناتۆرالیزمە. ڕاستییەكەی ئەوەیە كە *ڕیتسووس* گشت هێزو هۆشی خۆی لە كار دەكا هەتا شیعرەكەی نەبێتە ڕاگەیاندراوێكی تەواو سیاسی و چەپخوازانە و شتێكی كە بەرهەم دێت، ڕێككەوتنێكی شاعیرانە بێ كە ڕاستییەكانی مێژوو بەرەو سنووری هەرمانی ڕاكێش دەكا:

*سەرەنجام ئاوێنە، دەستە بڕاوەكانت*

*نیشان دەدا*

*ئیتر دەستت نییە*

*هەتا بۆ سەركەوتنت*

*چەپڵە لێ دەی*

ڕەنگە لە كورتە شیعرەكاندا ئەم كارە بەرچاو نەكەوی، بەڵام كاتێ وەبیر

شیعرەکانی دەکەوینەوە، جاری وایە دەبێتە ۱۰۰ لاپەڕە و دەبینین کە ئەم کارە لە شیعرە درێژەکاندا وەکو ڕۆیشتنە بەسەر لێواری چەقۆدا. ساتێك وریا نەبوون بەسە کە شاعیر بە تەواوی بە دوای دروشم نووسین و ژیاننامە بکەوێ، بەڵام ریتسووس هەمیشە پێی لەسەر خاڵی متمانە بەخشی شاعیرانە دادەگرێ بەم هۆیە هەمیشە فەزاکان دەگۆڕێن و لە فەزایەکەوە بۆ فەزایەك و لە چوارچێوەیەکەوە بۆ چوارچێوەیەکی تر و بەرەو ناتۆرالیزم و ریالیزمی تەکنیکی تایبەتی شاعیرانە و تەنانەت سووریالیزم دەڕوا بە چەشنێك کە شیعر هیچ کات فەزای سیاسی داگیر ناکا. ریتسووس بۆ ئەوەی لایەنی مرۆڤیی شیعرەکانی دیلی ڕوانگەی سیاسی یان فەلسەفەی چەپخوازانە نەبێ، هەمیشە لە فەزایەکی شاعیرانەدا وەگەڕیان دەخا و هەرکە لە شیعرەکانیدا تاکێك بیەوێ خۆی (ڕیتسووس) یان ئەو کەسەی بێ کە لە دەرەوەیە و لە ریتسووس دەچێ، دووریان دەخاتەوە. شتێکی کە بە هۆی ئەم تەکنیکانەوە لە چەمکەکاندا بەرهەم دێ ئەمەیە کە ڕوانگەی سیاسی و کۆمەڵایەتیی ئەو دەبێتە ناخی چەمکی شیعر و بەمجۆرە مرۆڤ و هەلومەرجەکان نەك بەرەو قۆناخێکی تایبەت و بەرەو دیرۆکێکی دیاریکراوی تایبەت بەڵکو بەرەو دەرەوەی مێژوو و نزیك بەو ڕۆژەڤەوە دەڕۆن. شتێکی کە لەم نێوانەدا دێتە بەرچاو ئەوەیە کە مرۆڤەکان تووشی مێژوو و دیترمنیزمی مێژوویی نابن کە ڕەنگە لە ئەندێشەی مارکسیستیی ڕیتسووس دا هەبن، بەڵکو لەسەر تەوەری شیعر و وشە و دەستەواژەکان، تەکنیك و فەزای شیعر دەڕۆن و هێزی لێ وەردەگرن. یەکێکی تر لەو شێوازانەی کە ڕیتسووس بۆ دەربڕینی شیعرە کۆمەڵایەتییەکانی بەکاری دێنێ کەڵك وەرگرتنە لە شتی سادە و ڕۆژانە بۆ دەربڕینی ڕووداوەکان کە لە درێژەی شیعرەکەدا بە ڕووداوێکی شاعیرانە دەگەن و تەنانەت بە قازانجی ئەو ڕووداوە، خۆ لادەدەن و گرینگییەکی ئەوتۆیان نابێ. کەڵك وەرگرتن لەو شتانە کە هەموو ڕۆژێ لە

بەردەستمان دان تایبەتمەندییەکی تری بووە و ئەویش سادەبوون و جێ متمانە بوونی فەزای شاعیرانەیە:

*دەڵێ ئەمە هێزێکە، ئەویتریش، بۆچی نا؟ با دەستنیشانی بکەین و لێی بدوێین. بۆ وێنە ئەو ڕەنگەی چەندین ساڵە بەسەر دیواری کۆنە و رابردوو، لە پشتەوەی پیرە پیاوی مۆنەوە بەجێماوە یان بۆ وێنە قاڵبی جەستەی دڵدارمان لە مەلافە چۆڵەکان یان مانگی وردبین لە پشت هەورەکانەوە...*

یانیس ریتسووس هونەرمەندێکە سالآنێکی دوور و درێژ زیندان و شاربەدەریی ئەزموون کردووە، تەنانەت دەگوترێت شاربەدەریی ئەوی بەهێز و مەزنتر کردووە، بە چەشنێك کە لە کاتی ژیاندا بە گەورەترین شاعیری زیندوو ناودێر کرا. رەنگە بتوانرێ بگوترێ کە *ریتسووس* بەم هەمووە سەختی و رەنج و ئازارەوە هیچ کات خۆی نەدۆڕاند، چونکە هەموو جارێ بە گوڕ و تینتر دەبوو لە پێشوو. ڕیتسووس بە شاعیری نەتەوەیی یۆنانی ناسراوە و رەنگە شاعیری نەتەوەیی جیهانیش بێ؛ چونکە ئەو ژانی مرۆڤایەتیی کرد بە شیعر.

پەراوێزەکان:

١–تقویم تبعید، یانیس ریتسووس، ترجمەی فریدون فریاد.

٢– اخر اما، دل یکی است، گزیدەی شعرهای جهان، ترجمەی احمد پوری.

٣– دهلیز و پلکان، ریتسوس، ترجمەی محمد علی سپانلو.

## یانیس ڕیتسووس، شاعیری بەندکراو

*ژاك لاكارییه*

*یانیس ریتسووس* لە ساڵی١٩٣٤ – دا یەکەم کۆمەڵە شیعری خۆی بە نـێوی *تراکتۆرەکان*، بـڵاو کـردەوە. لـەو کـاتـەوە ئـەگـەرچـی ئـازاری زۆری چێشت، بەڵام بۆ ساتێکیش وازی لە نووسین نەهێنا. شەڕ و پێکدادان، خۆڕاگری، زیندان و شاربەدەری نەیانتوانی ئەو شاعیرە رووناکبیرە سارد بـکـەنـەوە و تـا بـە ئـێستـا (تـا کـاتـی نـووسینـی ئـەم وتـارە) سێ بـەرگ لـە کتێبەکانی بڵاو بوونەتەوە. ڕیتسووس بە دەروەسترین شاعیری بەرەی خۆیەتی. ڕەنگە هـەر بـەم بۆنـەیـەش بێ کە لە دونیـای ئـەدەبیی یۆنـانـدا بـە ئـاستێکی پڕ شانـازی گەیشتووە. ڕیتسووس لە سەرانسەری ژیانیدا بوێری شاعیرانەی بە بوێری پیاوانەیەوە گرێ دراوە. وەفاداربوون بە خود و بڕوای تاقەت پڕووکێن بۆ جارێکی دیکە ئازادیی لێ زەوت کردووە: لە هـەمـان ڕۆژە سەرەتـایـیـیـەکـانـی کـۆدەتـادا دەستبـەسەر و شاربـەدەر کـرا. ریتسووس تا هەنووکەش لە فەڕانسە بە باشی نەناسراوە. بۆ یەکەم جار *ئاراگۆن* لە وتاری ٢٨ی فێڤرییەی ساڵی١٩٤٧– ی خۆی لە *لەلترفرانسز*

دا ناوبراو وەکو یەکێك *لە مەزنترین و سەمەرەترین شاعیرانی هاوچەرخ* دەناسێنێ و ڕێزی لێ دەگیرێ. بەڵام بەشێکی زۆر کەم لە بەرهەمەکانی شاعیر وەرگێڕدراونەتەوە سەر زمانی فەڕانسە. هەتا ئەم دوایانە دوو کۆمەڵە شیعری وەرگێڕدرابووەوە، *بارستی چوارەم*، ئەو شێعرانە وەخۆ دەگرێ کە لە ساڵانی١٩٥٧– ١٩٥٤دا نووسراون و ئەویتریان *شایەتحاڵییەکان* کۆی شیعری ساڵانی١٩٦٣– ١٩٦٢ ه. هەڵبژاردەی شیعرەکانی *ڕیتسووس* لە ژێر ناوی *"خانووی کرێ"* کە لەم دیوانەدا لە لایەن یەکێتیی *بڵاوکەرەوەکانی فەڕانسەوە* چاپ کراوە، ئەم فەزا بۆشەی بە شێوەیەکی بەرچاو پڕکردووەتەوە.

ئەم کۆپلەیە بەشێك لەو شیعرانەی وەخۆ گرتووە کە لە نێوان ساڵانی ١٩٥٧–١٩٦٥دا نووسراون: ماڵاوا ١٩٥٧، کاتێ بێگانە دێت ١٩٥٨، درەخت، زیندان، ژنان ١٩٦٣، فیلۆکتێت ١٩٦٥، نووسین گەلێك لە پەراوێزی زەماندا ١٩٦٥–١٩٦٦.

هەرچەند بەشێك لە شیعرە دوور و درێژەکانی *ڕیتسووس* وەکو *ئێپیتافیوس* ١٩٣٦ و *شێوی یۆنانی* ١٩٥٣، وەرگێڕدراونەتە سەر زمانی فەڕانسە بەڵام خوێنەری فەڕانسەیی، زمانێکی هەڵبژێردراوی بەرهەمەکانی ڕیتسووس لەبەر دەستدایە کە بۆ ناسین و ڕێزگرتنی پوخت و پاراوە.

زیاتر لە سی ساڵ شیعر، زیاتر لە سی ساڵ لێکۆڵینەوە و سروود و ڕاپۆرت و هەقیقەت نووسین و هاوار، ژیان و مێژووی یۆنانی هاوچەرخی گەمارۆ داوە و هاوڕێی بووە. ئەمەش بەم واتایە نییە کە شیعری ڕیتسووس بە مانای بەرتەسکی وشە دەبێ ڕیالیستی و دەرووەست بێ:

لە پلەی یەکەمدا شیعری ئەو تەواو ئازاد و بەر فرە و ئامادەی هەموو چەشنە ئاڵوگۆڕییەکی زەینییە. لە دووپات بوونەوە بێزارە و بەدوای

دۆزینەوەی شتی نوێیە. بە یارمەتیی کرداریی نووسراوەکانی بنچینەی ڕووداوە ئەزموونکراوەکان یان خەیاڵکردن دەدۆزێتەوە.

شیعری ناوبراو زیاتر ئیلهامە و خوازیار، بەڵام زۆر جاریش گێڕانەوە و دڵدانەوە و مۆسیقایییە. لێرەدا هەر بەم پێیە زمان ئاڵوگۆڕی بەسەردادێ: جاری وایە، ڕووت و بێ پێچ و پەنا وەکو لێواری گاشە بەردە و جاری واشە، لێریك و ئاڵۆز و پڕە لەو ئامـاژانەی کە لە وشە و هەستەکان وێنەگەلی پڕ لقوپۆپ دەکێشێتەوە.

## سروودی دنیایەکی نوێ

قۆناغی یەکەم  کە دەتوانین نێوی قۆناغی پێش شەڕی لە سەر دانێین، (ساڵانی بڵاو بوونەوەی *تراکتۆرەکان* ١٩٣٤، *ئەهرام* ١٩٣٥، بە تایبەت *قسنەبەرد* ١٩٣٦) ئەم قۆناغە زیاتر لە گەڕان بە دوای کردەوەیەکی ڕوون دا، توندو تیژ و تارادەیەك ئاگرین نیشان دەدا و هەروەها لە پشکنین و گەڕانی ئەو شیعرە جیا بووەتەوە کە بەدوایدا هاتووە. دنیای نوێ سەرکەش و دراماتیکییە و هێرش دەکاتە سەر دنیای شیعر و شاعیری: دنیای ماشێن و دنیای کرێکاری برسی و ئەشکەنجەکراو ڕاستییەکی تەواو تاقەت پڕووکێنی یۆنانییە کە تا ئەوکات شاعیرانی نەخستبووە ژێر کاریگەریی خۆیەوە. وەها دنیایەك ڕێیەکی *ڕووناك و بێ خەوشی دەوێ* و دەنگێکی ئەگەر نەڵێین سەرکۆنەکەر، ڕەخنەگرانەی هەیە:

*خوای من، بە ڕاستی گەر تۆ خودا بووی و*

*ئێمەش کۆرپەی تۆ*

*دڵاوا بووی بەسەر دەستکردەکانی خۆت*

*وەکو من*

*گەر عادڵ بووایەی*

*بەشی هەرکەست بە خۆی دەبەخشییەوە*

*تاکو لە کاتی برسێتیدا*

*هەموو باڵندەیەك و هەموو منداڵێك*

*خۆی تێر بکا*

ئەمە ئەو شتەیە کە لە ساڵی **١٩٣٦** لە *قسنەبەرد* دا نووسراوە. ئەم کۆپلەیە لە سەردەمای دیکتاتۆریی *متاگساسدا* چاپ کرا. بەرپرسە دەوڵەتییەکان پەسەندیان نەکرد و لە ئاکامدا پێیان گوت: *هەرەس هێنەر*. بڵاوکردنەوەی ئەم کۆیە قەدەغە کرا و گشت چاپەکانی ئەم کتێبە لە بەرامبەر پەرستگەی زیوس ئۆلۆمپیەنی ئەسینادا سووتێندرا. بەڵام دەنگی ریتسووس پڕ بوو لە گەرموگوڕی نزیکایەتی و تەنانەت تووڕەیی. قسنەبەرد گلەیییە. گلەیی دایکێك لە مەرگی کوڕەکەی کە لە شۆڕشی کرێکارانی مانگرتوودا کوژراوە. نێوی ئەم کۆپلەیەش نێوێکی ئاینییە.

قسنەبەرد لە جیاتی کفن بە گوڵدۆزییەك (نەخشێك) شوبهێنراوە کە مەسیح لە نێو گۆڕدا نیشان دەدا، لە هەر هەینییەکی پیرۆزدا دەچنە کەنیسە و دەیهێننەوە دەرێ تا ژنان لەسەری شین بگێڕن. بەڵام ریتسووس ئەم گریان و ڕۆڕۆیە دەخاتە ئەستۆی مرۆڤەکان و مەرگی زاڵمانەی کوڕێك (*سالۆنیك*. مەی **١٩٣٦**). دایکی بۆ مەرگی کوڕە کوژراوەکەی کۆڵانان دەکا و دەگەڕێ. لە دەوروبەری هەراهەرای شەپۆلی شۆڕشی کرێکارە مانگرتووەکان باڵا دەکا و تێك دەشکێنێ. *ریتسووس* بە مەبەستی نیشاندانی سروشت و هەستی دایك کە لە سەرەتای شێعرەکەدا زۆر سانا دەڵێ:

*ئەو باڵای خەمی خۆی دەهۆنێتەوە*

***

لەو *پەرەی شتە ساکارەکانەوە، خۆم دەشارمەوە*

*تاکو بمدۆزنەوە*

گەر پێم نە*زانن، لانی کەم هەست* بەم *شتانە* دەکەن

ئەم هونەرەی شاعیر، ناوی *هەستی سانا بوونی* پێدەبڕێ کە لە ساڵی ١٩٤٦دا خولْقاوە. لە راستیدا ئەم شیعرە زۆر بە دەگمەن توانیویەتی لەو پەڕی ڕووناکیی وشەکانییەوە بوونی ژیانی شاعیرێك نیشان بدا. بەڵام تەنانەت کاتێ جێ ناوی یەکەم کەسی تاك بەکار نەهێنێ دیسان دەتوانرێ شوێنی ژیانی ئەو، ساوایی پڕ ئازاری ئەو (بنەماڵەی شاعیر بە هۆی شێتی یان زەردووی مردوون) بناسرێت و هەروەها بیرەوەریی ماڵەکەی کە لە باشووری *پلوپونزە* و خەمی دووریی هەمیشە گەڕ، کە باڵای بەسەردا کێشاوە، دێتە بەرچاو. جاری وایە بە شێوەی راستەوخۆ، جاری واشە بە شێوەی نهێنی، لە شیعر گەلێك وەکو *ڕووناکیی زستان* ١٩٥٧ و *خانووی مردوو* ١٩٦٢ دا دیارە.

مۆتەکەی ئەم شوێنە وەکو میرات پێمان دەگەن، هەروەها هەزاران ئەزموون کە ناوبراویان لە زیندانێکەوە بۆ زیندانێکی تر و لە تاراوگەیەکەوە بۆ تاراوگەیەکی تر هاندراوە (ریتسووس لە ساڵی ١٩٤٨تا ١٩٥٢ بۆدوورگەکانی ماکرونیسووس و ئای فستراتیوس دوور خراوەتەوە و لەم دوورگەیەی دواتردا بوو کە شیعرە پڕ بایەخەکانی *نامەیەك* بۆ *ژۆلیۆ کوری* لە ساڵی ١٩٥٠دا هۆنییەوە). ئەمانە دایمە لەو شیعرانەدا خۆ دەنوێنن کە شاعیر دوای شەڕ و گەڕانەوە بۆ ژیانی ئاسایی نووسیونی و بە وتەی خۆی وزە و گەرموگوڕییەك بە خەیاڵ و وێنەکانی دەبەخشن کە تایبەتە بە پەرستنی ڕاستەقینەی بوونەوەران و شتەکان و ئەو ساتە دژوارانەی کە هەقیقەتی یۆنان دەخەنە ڕوو. ئاڵوگۆڕ بەسەر شێوازی ئەو دادێ. کردار گوشاری کەمتری هەیە، هاوسەنگ دەبێ وەکو تانوپۆی وێنەکان خۆ نیشان دەدەن کە هەرکامیان بەشێکن لە دڵی

مـرۆڤـایـەتـی و وێنـەکـانـی ڕۆژانـە. لـەم قـۆنـاغـەدا واتـە لـە نـێوان سالانـی ١٩٥٣– ١٩٦٠ دا *ریتسووس* چەند پارچە شیعرێك چاپ دەکا: *خاتوونی رەزەکان* ١٩٥٣ کە بە دەنگی خۆی تۆمار کراوە، شاری نافەرمان ١٩٥٣، *سووتانی مانگەشەو* کە لە ساڵی ١٩٥٨ دا خەلاتی شیعری نەتەوەیی وەرگرت.

هـاوکات لەگەڵ ئەم بـەرهـەمانە بەشێکی زۆر لەو شیعرانەی کە لە پێش و دوای شاربەدەریی نووسیبوونی لە دیوانێکدا بە نێوی *شەونخوونی* بـلاوی کـردنـەوە. یـەکـێك لـەو شیعرانـە نـێوی *یۆنانییە*. *یۆنانـی* ئاوازی نەتەوەیەکی پێگەییو و ئاگادارە، ئاوازێکی سەخت و دڵڕەقانە، ئاوازی لە خۆبایی بوون و یاخی بوون. هـەروەهـا ئـاوازێکە لێوڕێژ لە ئەشق. ئەشق بە ولاتێك کە وەکو خەڵکێکی ڕووت و ئەشکەنجەکراوە. چارەنووسی یۆنان لە دوای شەڕ و بەربەرەکانێی هەمیشەیی پێویست (پێویستتر لە هەموو کات) دژ بەو هێزانەی کە ستەمکردن لە یۆنان بەڕەوا دەزانن، هەروەها دڵتەنگیی ولاتێکی نەزۆك بەلام خاوەنی زۆر پیاوی دلاوا، بە تەواوی لە شیعرەکەدا جێی خۆی کردووەتەوە. بەشێك لە ڕستەکانی ئەم شیعرە دەتوانێ بە یەکەم سروودەکانی پارتیزانی دابنرێ کە لە لایەن شاعیرێکی یۆنانییەوە هۆنراوەتەوە. سەرانسەری سروشت لە بەربەرەکانی مرۆڤ گەلێك بەشداری دەکا کە بۆ داڕشتنی داهاتوو، تەواوی میراتی شەڕەکانی ڕابردوو و مۆتەکەی چاودێریی باب و باپیرانی خۆی دەوێ:

*تووڕەیی بێدەنگی ئاوێتەی ئەم هەرێمە بووە*
*بەردچنە سووربووەکان بە بەرۆکییەوە دەگوشێ و*
*ڕەز و زەیتوونی هەتو وەخۆ دەگرێ*
*ولاتی بێ ئاو، بەلام پڕ لە رووناکی*
*ڕێگا نوقمی نێو ڕووناکییەکان دەبێ*

*ئاسن نسێی ماڵێیه.*

نـاهـومـێدیـی شکست، هـێزە بـەفـیـڕۆ چـووەکـان، خـەون و خـەیـاڵـە لەناوچووەکان، ئەو پیاوانەی شاربەدەرکران، شەرمەزاری بێدەنگی بوون، هیچ کامیان لە نێو ئیرادەی شاعیر و ئیمانی ڕۆحانیی ئەودا قەیران و بشێۆی دروست ناکەن، ئەگەرچی بڕوای ڕۆحانیی ئەو داکۆکی لەوە دەکا کـە ژیـان و بـەرخـۆدانـی بـۆ پـاراسـتـنـی خـاك، تـەنـانـەت بـە بـچـووکـتـریـن قارەمانێتیی خۆڕاگریی خۆیان دەسەلمێنن:

*ئەمانەن کە هاتوچۆیانە بە نێوان لێوەکانی هاوین و*

*بەجێی تووتن، گەڵای ئەستووری شەو هەڵدەپێچن*

*بە جێی سمێڵ، قەڵەمستانی پنگە سەحراییەکان کە تۆزی*

*ئەستێرەی لێ پڕژاوە*

بە جێی *ددان: گابەرد و خوێی ئیژە.*

لـەم شیـعـرانـەدا پـارێزەریـی خـۆڕاگرتـریـن وێـنـەن. شاعیر، سەربـازان، پیاوان و ژنـان، لەشکر گەلێکن کە لە بەرد، نیگابـانیی دەروازەی داهـاتوودا دەدەن. هـەر بەو شێوەیەی کە لە سەردەمی رابردوودا باب و باپیرانی بیزانسی ئەوان سنووری قەڕاڵستانیان دەپاراست.

ئەم کۆپلەیە هەر وەکو *قسنەبەرد*، ئیلهامی بە میکیس *تیۆدۆراکیس ی* ئـاواز دانـەر بـەخشیـوە تـاکو ئـاهـەنگی جـوان، بـخـولـقـێـنـێ. شێعرەکـانـی *ڕیتسووس* و ئاوازەکانی *تیۆدۆراکیس* بۆ *یۆنـانـی* شاکارێکی خوڵقاندووە کە بەشێکی سروودی شەڕ و بەشەکەی تری لاوکی ژنە دێهاتییەکانی یـۆنـانـە کـە لـە کـاتـی نـاشتـنـی مـردووەکـانـدا دەیـبـێژن. ئـەم بـەرهـەمـە بـە چـەشنێکی سـەرسووڕهـێنـەر ئـارەزووگـەلـێکی بـەدی هـێنـا کـە لـە هـاویـنـی ١٩٥٩ دا، واتە لە کاتی دانانی ئاوازی قسنەبەرد لە دڵی ئاواز دانەردا دابوو:

ئاوازی سووك فەرامۆشی دێنێ. سروودی نەتەوەیی ئێمە ناچارمان دەكات لە یادكردنەوە بەردەوام بیربكەینەوە.

هەر بەو چەشنە شاعیر دەڵێ:

ئەمە هەمان بیرەوەری نەتەوەیی منە كە لە هەوڵی وشیاركردنەوەیدا دابووم و گشت هەوڵی خۆمم بۆ تەرخان كردووە.

*ئەو ڕۆژەی سێ هەزار ساڵ لەمەو پێش دەستی پێكرد*

*ریتسووس* ئەم بیرەوەرییەی لە كۆی بەرهەمەكانیدا گێڕاوەتەوە. بیرەوەریی ئەو بەربەرەكانییانەی تا بە ئێستاش زیندوون و هەروەها بیرەوەریی رابردووی دوور و تاڕادەیەك لەمێژینە كە زەمانی كرداری شیعرەكان تا بە هەنووكە نیشان دەدەن. *خانووی مردوو* تاكە خوێنیی قەیرە كچێكە كە لە ماڵی چەپەكی خۆی لە *ئاراگۆسدا* بەسەرهاتی ئێلی *ئاترید* دەگێڕێتەوە كە لە خەیاڵی پرتاویاویدا زیندوو بووەتەوە. *فیلۆكتێت* ١٩٦٥ تێڕامانێكی دوور و درێژە لە بارەی بایەخە خەیاڵییەكانی شەڕ، چیرۆكی قارەمانێك دەگێڕێتەوە كە شەرمەزار بووە بە دوورە پەرێزی لە دوورگەیەكی چۆڵ و ئەم شیعرە لەگەڵ ئەو شتەش كە *سۆفۆكێل* بە جیاوازی نیشان دەدات.

هاواری مرۆڤایەتی، بۆنوبەرامەی ژنانە، بایەك كە لە كاغەزە دیوارییەكان دەدڕێ، درەختێك كە لە جەنگەڵی هەمبەرماندا هەڵدەبڕدرێ، لەوپەڕی زەمانەوە خەڵك بە شەریكی رەنج و خەیاڵ و لە خەو ڕاپەڕین دەشوبهێنێ. دەڵێ هەنووكەش، درەخت دەكەوێ و بۆنی خۆش ڕێڕەوی كۆنە ماڵ پڕ دەكا و ئەم پیاوانە هەرچەند ڕەوشتی نەریتییان هەیە، بەڵام بەرەو بەربەرەكانی نێوساتەكانی ئێستا دەبنەوە. لە دوایین شیعرەكانی ریتسووسدا *نووسین لە پەراوێزی زەمان* ١٩٦٥–١٩٦٦ سەردێڕێكی كۆن دەنووسرێتەوە. لەم شیعرانەدا هەمان سەرنج بە ژیانی ڕۆژانە دەدرێ كە

لە چەندین شیعردا درەوشاوەتەوە. سیمبولێکی هەورەبرووسکە ئاسا لە ڕاستەقینە کە جار لەگەڵ جار، زیاتر باڵا دەکا، هەر وەکو زیادبوونی دەقیقەیەك بە دەقیقەیەکی تر، هەتا ڕۆژێك لە ژیانی مرۆڤێ بخولقێنێ. ڕۆژێك کە ڕەنگە لە سێ هەزار ساڵ لەمەو پێشەوە دەستی پێ کردبێ ڕەنگە تا ئەمڕۆ کۆتاییی پێ بێ– تەواو بێ؟ نا، بە پێچەوانە درێژەی پێ دەدرێ.

*نە دووری، نە خامۆشی، نە مەرگ،*

*هیچ کام ناتوانن ژیان بخنکێنن.*

بێ ئەقڵی و خۆ گێل کردنە. گەر وا بیر بکەنەوە کە دەتوانن دەنگی سەربەرزان بخنکێنن؟

شار بە دەرکردنی ڕیتسووس– هەرچەند ئەم جارە ناتوانێ بنووسێ و بدوێ– دەنگی نزیکتر دەکاتەوە و بێدەنگیی شاعیر بێ شك خوێنڕێژیی ئەوانە ئاشکرا دەکا کە باش دەزانن کێ لە ناو دەبەن:

*پیاوێك کە زیاتر لە هەموو کاتێ دەیویست بە بیرەوەریی نەتەوەکەی وەفادار بێ.*

***

## شیعر

چیها ساڵە

شیعر

بە دوای خوێنەریدا هەڵوەدایە

لە ئاکامدا

لە تەوژمی نسێی بەرفرەترین باڵەکان و

لە تاریکیی قووڵترین شەوەکاندا

لە نێو باخێکی لق داڕووتاو

دەکەوێتە سەر ئەژنۆ،

قوڵاپی قەسابی پێوە هەڵواسراوە.

# گومان لێکراو

دەرکەی قفڵ کرد.
ئاورێکی گومانـاوی.
لە کاتی لە گیرفان ڕۆکردنی کلیل، بەدیل گیرا
چەندین مانگی پڕ ئەشکەنجەی تێپەڕکرد
تا شەوێك دانی بەوە هێنا، ئەوە خاوەنی کلیل و ماڵ
(ئەمەش بووە هۆی تاوانبـاربوونی)
بەڵام کەس تێ نەگەیشت لە هەوڵی ئەو بۆ شاردنەوەی کلیلەکەی
بەو هۆیە ئەو ئەمێستاکەش
گومان لێکراوە

## گەڕانەوە

لەپێشدا پەیکەرەکان و
دوای چەند ساتی تر
مرۆڤ، درەخت و بوونەوەران رێیان گرت
هەموو شوێنێك کپ و بێدەنگ
چۆڵی چۆڵ
با کەوتە گەڕیان
لە شەقامدا ڕۆژنامە و دڕك و داڵ سەرگەردان بوون
ڕۆژاوا
چراکان بێ هۆ کوژانەوە
پیاوێك بە تەنیا هاتەوە، چاوی بە دەوروبەردا گێڕا
لە گیرفانی کلیلێکی دەرهێنا و لە زەویی رۆکرد
دەڵێی دەیخاتە نێو دەستێك وا لە خاك هاتووەتە دەر یان
درەختێك دەچەقێنێ
ئەو کات بە پلیکانە مەڕمەڕینەکاندا سەرکەوت و
چاوی بە شارەوە هەڵواسی
پەیکەرەکان بە وریایی
دوابەدوای یەك گەڕانەوە.

# زیندانی

که پەنجەرەی لێك دەترازاند

خۆی دەدیت

لە ئاوێنەی ژووری ماڵەکەی ئەوبەری شەقام

دەڵێی بە پێ دزەوە چووەتە ژووری

چ ئازارێکە ناتوانی

لەوێکانە نەختێك هەوا و پەڵەیەك هەتاو بهێنییەوە.

ڕۆژێکیان بەردێکی هەڵگرت

سیلەی گرت و هاوێشتی

دەنگی بەرد دراوسێی هێنایە بەر پەنجەرە، گوتی:

باش بوو. کە دەمویست لە ئاوێنەدا بڕوانمە خۆم

*ئاوێنەی تۆ لە پشت سەرمەوە دەیڕوانیم،*

*چ ئازارێ بوو.*

پیاوەکە گەڕاوە بۆ ئەو دیوەی پێش ئێستای خۆی.

هەر لەوێ، لە نێو ئاوێنەی ئەودا دراوسێ

ڕاوەستا بوو

بە خەنجەرێك لە نێو ددانی دا.

## تەسلیم

ژنەکە پەنجەرەی ئاواڵا کرد
بە هێرشێك
بـــــا ـ زولفەکانی خستە سەر شانی
وەکو دوو مەل،
پەنجەرەی کپ کرد
دوو باڵندە لەسەر مێز بوون
دەیڕوانن
سەری دانەواندە نێوان هەرکیان و
هێدی گریا.

## ڕێگەی ڕزگاری

شەوگار، پڕ لە تۆفانی سامناك
ژنێکی تەنیا
گوێی هەڵخستووە بۆ ئەو شەپۆلانەی بە پلیکاندا هەڵدەگەڕێن
پەشۆکاوە لەوەی
ڕەنگە بێنە نهۆمی دوو
پف لە چرا بکەن، شەمچەکان تەڕ بکەن و
بگەنە لای پێخەف
ئەو کات گڵۆپ
لەسەری نوقم بوویەکی نێو ئاو دەچێ
بە ئەندێشەیەکی تاك و زەردەوە
ئەم بیرە بۆ ئەو ئەرخەیان بەخشە
بۆ جارێکی تر شەپۆل دەکێشێتەوە
دەڕوانێتە گڵۆپ
تەمێك لە خوێی پێداکراوە.

## سێیەم کەس

لەبەر پەنجەرە هەرسێکیان دانیشتن
چاو بە دەریاوە
یەکیان لە دەریا دوا، ئەویتر گوێی هەڵخست.
سێیەم کەس نەگوتی و نەگوێی دایە
ئەو نوقمی دەریا بوو
لە پشت پەنجەرەوە
ئاشکرا لە نێو شینایی رەنگ پەڕیوی ئاودا
دەجووڵاوە بە ئارامی
لە پاپۆڕدا
نوقم بوویەك
زەنگی رزگاریی نوقم بوو لیێ درا
لەسەر دەریا بڵقە وردەکان بە دەنگێك بڵاو بوون
لە پڕ پرسیارکرا: نوقم بوو؟
ئەویتر گوتی: نوقم بوو
سێیەم کەس لە ناخی دەریاوە دەیانڕوانیێ
دەڵێی دەڕوانێتە ئەو دوو کەسەی وا نوقم بوون.

## ویستن

لە کۆتاییی شەقام، ئاوا بوونی پیاوێك
مانگ لە باوەشی ئاسماندا
لە نێو درەختەکان، قیژەی باڵندەیەك
چیرۆکێکی ئاسایی، سانا
هیچ سەرنجێ بەدی نەکرا
لە نێوان دوو دارتێلی سەر شەقام
پەڵەیەکی گەورەی خوێن.

## تاجە گوڵینە

سیمات لە گەڵاکاندا نیهان بوو
دانە دانە گەڵاکانم لێکردەوە تا بێمە لات
دوایین گەڵام لێکردەوە
ڕۆیشتبووی...
لە گەڵاکانم چنی، تاجە گوڵینەیەك
کەسم نەبوو پێشکەشی بکەم
ئاویزانم کرد بەسەری خۆمدا.

# ژنان

ژنان زۆر دوورن. مەلافەکانیان بۆنی شەوباشیان لێ دێ
لەبەر ئەوەی هەست نەکەین بە نەبوونیان
لەسەر مێز نان دادەنێین
دواتر پێ دەزانین
ئەمە خافڵ بوونی ئێمە بوو
لەسەر کورسی هەڵدەستین و دەڵێین:
تۆ ئەمڕۆ هیلاکی کاری یان
لێ گەڕێ، من فانووسەکە ڕۆشن دەکەم
کاتێ شەمچە هەڵدەکەین
بە هێمنی وەردەسووڕێ و
بە سەرنجێکی سەر بە مۆرەوە
بەرەو چێشتخانە دەڕوا، کۆڵی
گردێکی خەمبار و ناخۆشە، هەڵگری چیها مردووە-
مردووەکانی بنەماڵە، مردووەکانی خۆی، مەرگی ئەتۆ
لەسەر تەختە ڕێژە کۆنەکەی ژووری
دەبیستی دەنگی جیرە جیری هەنگاوەکانی
تۆ ناڵەی قاپەکان دەبیستی لەسەر تاقەی چێویدا و
دواتر دەنگی قەتار
کە سەربازان بۆ شەڕ دەبا.

## ئیشی شاعیر

لە ڕێڕەودا،

ئاوێنە، چەتر، چەکمە

لە ئاوێنەدا،

پەنجەرە کەمێك هێدی ترە

لە پەنجەرەدا،

نەخۆشخانە لەوبەری شەقام

لە شەقامدا،

ریزی دوور و درێژی سیما ئاشناکان و

بێ قەراریی ئەوانەی وا خوێن دەبەخشن

لە نەخۆشخانەدا،

شەش نەخۆشی ئورژانس،

مردوو.

# خاتوونی ڕەزەکان

١

خاتوونی رەزەکان،
لە سپێدەی بەیانیدا تۆمان دیوە
لەوبەری تۆڕی جەنگەڵی کاژەوە
تۆ خەریکی هەڵوەژاردنی کەوێڵی شوان و هێلانەی هەڵۆکانی
لە ژێر تیشکی ئەستێرەی بەیان
بەداوێنتەوە لەرزانەی نسێی گەڵای رەزەکانە
بە گوێتەوە دوو هەنگ وەکو دوو گوارەی ئاوێزانن
بەرتەسکیی رێی هەڵقرچاوی ژێر هەنگاوت
پڕ شکۆفەی نارنج بووە
خاتوونی ڕەش پێست،
دوایین تیشکی خۆرەتاو
لە دەستەکانت
سیمای مریەمی پیرۆزی خوڵقاندووە.
لە جەغزی گەرووتدا
ئاونگی شەوگار دەدرەوشێتەوە
وەك ئەستێرەیەکی بەجێماو لە کاروانی کاکەشان
پێش ئەوەی ئاوا بێ
بە ملتەوە شۆڕابەی بەستووە

وەکو دەنگی ملوانکەیەك کە بەرەو تینی بەرۆکت دەخزیٚ
تاریکی خەست بووە
وەکو شیری نێو سەتڵێك لە سنەوبەر
کێڵگەی زەوی
بۆنی عەتری کەنیسەی یەکشەممە شەوی جێژنی گرتبوو
لەگەڵ بریسکانەوەی شینی سپێدە و
دوو پەڵە ئەستێرە لەسەر سەدەفی بەیانی
شوانەوێڵە
لە خەوی سەر گاشە بەردێك دێتەوە
وەکو خۆ دەرکێشانی قرژاڵێك لە ئاو
خاتوونی مەزن،
چ ئارامە یەکەم *رۆژباش ی* درەختی پرتەقاڵ
چ ئارامە ترپەی هەنگاوی تۆ و
هەناسەی ماسی لە بەستێنی مانگ
چ  ئارامە زمزمەی ئەو مێرووولانەی لە هەمبەر میحرابی گوڵی مینان
ئاونگ بە قەرز تێدا گوورانی چ رەنگێکی زێرینی هەتاو
هەست پێدەکا
کاتێ ئەستێرەی بەیان
لە تەوێڵی تۆ حەوت گوڵی رۆزی سپی، شەتڵ دەکا
ئای چ شیلەیەك بە لێوی هەنگەوەیە بۆ سازدانی هەنگوێن
ئای بێدەنگی لە ناختدا چ ئاوازێکە بۆ خوێندن!
لێرە شەو و بەیان بە لەرینەوەیەك ئاوێتەی یەکترن

کاتێ تۆ ئارام دەگری
بەسەر ئەژنۆتەوە درەوشانەوەی دەستەکانت
وەکو درەوشانەوەی دوو کۆتری تیشکن
لە ئاسمانی جەنگەڵدا.

٣

خاتوونی ڕەزەکان،
شانی ئێمەچۆن ئاسمانێکی وەها هەراو کۆڵکێش بکا؟!
چۆن ببیستین ئەم هەموو بێدەنگییەی لە رازی درەختەکان
دەدوێن
نەهەنگێکیترووسکەدار
بە دەریای بێ شەپۆڵدا تێپەڕ دەبێ
وەکو چەقۆیەك کە نان لەسەر مێزی ماسیگر لەت بکا
وەکو یەکەم تیشکی تیژی خۆرەتاو کە خەو هەڵبدڕێ
لەسەر جادەی بریسکانەوەی بەردەکانە و
باڵندەکان جێ پێی ئەو پەیژەیەن کە بەرەو ئاسمان دەڕوا
ئاوازی هەتاو بڵێسەیە، نیوەی لە دەریا و ئەویتر لە ئاسماندا
وەکو پرتەقاڵێك لە بەتاڵیی دەستی تۆدا
یان وەکو گوێت لە ژێر زولفەکاندا
تۆ باڵا هەڵپەسێراو
بە هێزەوە ڕاوەستاوی
لە ناوەندی جیهاندا
بە دەستی چەپەوە تەرازوویەکی گەورە و
لە دەستی ڕاستدا شمشێری پیرۆز

ئەتۆی خوداوەندی جوانی و مەزنایەتی.
تۆ یۆنانی،
کاتێ بە مەزرای گەرمەشانیدا تێپەڕ دەبی و
هەوای ئاوریشمین ئاوالا دەکەی
قژی زێڕینی گەرمەشانی
دەلاوێنێتەوە بن هەنگڵت
دەڵێی شوانێکی لاوە سمێڵی تێ هەڵدەسوێ
شەپۆلی لەرینەوەیەك، خۆ بە زولفی گەرمەشانی دادەدا
چنارەکان بە خشپە خشپ، شۆڕ دەبنەوە سەر کانییەکی فێنك و
بە دەورییەوە
کێوەکان وەکو جەرە چاوەڕوانی پڕبوونن
خاتوونی ڕەزەکان،
لەسەر سینگی ئێمە بریسکانەوەی ڕوخساری تۆ
وەکو هەورێکی سپی
بە داوێنی چیای پڕ جەنگەڵدا
ڕووبار وەکو شوێنێکی دەستەمۆ، شوێن هەڵگری تۆیە
بۆ دێرانی دەشتەکان
تاڤگەیەك لە تیشکی هەتاو وەرێ دەخەی و
باڕووت و ئاواز دەبەخشی
بە شوانان!!
ئەو کاتەی بەرخ و ئەسپەکان
تۆ بە خوشکی خۆیان دادەنێن

٥

ڕۆژەکان بە قەرتاڵەی پڕ لە ترێوە تێپەڕ دەبن
خۆ لە جەنگەڵی کاژ دەهاڵێنن
تۆ ترپەی پێیان نابیستی
ئەوان دەنگی ئەو ڕووبارانەی بە فەزاوە ئاوێزانن جێ دەهێڵن و
تۆ نایانبیستی
بۆیە لە بەرهەڵبێنەی تۆدا
جیك جیکەیەك سازی خۆی کۆك دەکا
درەختی هەڵوو لەسەر دەستی تۆ سفرەی خۆی ڕادەخا و
لە بۆرەتاری ڕێگای تۆدا
گێلاسەکان وەکو چرای سوور دەدرەوشێنەوە
شەوێ کاتێ بە گۆزەی ئاوی سەرشان
لە گەڕانەوەدای
بێدەنگی گشت دەشتەکان ئاوێزانی بازۆڵەتە
وەکو قەرتاڵەیەکی پڕ لە شاتوو
ئەستێرەی شەو شانبەشانی تۆ
هەنگاو دەنێتە نێو درەختە ژەهراوییەکان
لاڵ و واڵە بۆیە ئەنگوستەکانی لە ڕووبار ڕۆ دەکا
کوڕێکی شوان لە ترسی پچڕانی دڵ و شمشاڵ
گۆشەی نیگای بەرەو شمشاڵەکەی
بێ ئەوەی بە لێوی ئاشنا بێ

ئەوکات جوانەگایەکی بێ هەست و خوست
وەکو پەیکەرێکی تاشراو لە شاخ
دوو پەڵە هەور لە عوود دەردەداتەوە
هەتا لە ڕووناکیی دوای ڕۆژاوا
نسێکانیان بە نێو دەشتدا تێپەڕ بێ
وەکو دوو پاپۆڕ
کاتێ دەرگا بەسەر شەودا کپ دەبێ
چرای ماڵێ لە شیرین خەو دایە
کاتێ نان لەسەر مێز
تەنیایە وەکو رۆحی جیهان
دەزانین بۆ جارێکی تر تۆ
لە حەوشەی ماڵماندا سەرگەردانی
تا پێنج چەپك گەرمەشانی
بە دەرکەی ماڵەوە هەڵواسی و
بە گۆزەکەت
بنچکی گوڵە سوورەکان پاراو بکەی
کاتێ لە خەو داین
بە دەورماندا جار نەجارێ لە سووڕانەوە دای
وەکو زڕەی ناوادەی دەنگی مێگەل لە دەوری شوانی خەوتوو
ڕێگای تۆ بە نێو ئەو خەڵکەی لە خەو دایە
وەکو بریسکانەوەی ڕێی مریەمی پیرۆزە لە نێو بەرخە
خەوتووەکان و

ڕێگەی ئاسان بە نێو قامیشەڵانی کەنار ڕووبار
ئەم دەنگەی ئاو ئاوێزانی شەوە
لە ژێر ئەستێرە ساردەکان سەهۆڵین دەبێ
وەکو سوێسنی کریستاڵی
تا لە جامی ڕۆحدا بیپارێزین

١٥

خاتوون،
بۆ سەرگەردانی لەم کێوانە
هەورەکان بۆ لێك پرش و بڵاون؟
ئەمڕۆ مێگەڵ بەرەو ئاغەڵی شەون و
رەنگی شەبەنگ لە خوریی خۆیان هەڵدەسوون
ئەمڕۆ هەڵۆ چنگی خۆی سووراو دەکا
بێ خوداکان بۆ تالانی ڕەز هاتوون
هەنجیر لە لقەکان دەبڕن
وەکو کۆرپە لە ملی دایك و
باسکی پەیکەرەی مریەم هەڵدەکەنن و
لە بازاڕی فرۆش دان
خێڵی کوللە حاسڵ دەجوون
چەقۆیەك لە پشت سەرەوە دادەنیشێ و
ئەفعیی ددان تیژ وەکو بووکێ
خۆ دەنوێنێ

خاتوون،

هەنووکە بۆ ئەو مێگەلە وەرکەوتووانەی نێو نسێ

کێ لە ژەنینی شمشاڵ دایە؟

ئیتر کێ دەتوانێ ئەو سەولانە بپارێزێ وا

لەش شۆراوی نێو ڕێگەی کاکەشانن؟

لە جەرەی ئیمەدا ڕقێکی لەمێژینە هەڵدەچێ و

ئاخی هەزاران هاوین لە ناخی بۆشکەکانی (بەرمیل)ە شەڕاب دایە

لە مجریدا

کورتەکی دایە گەورە خەون بە"بوبولینا"وە دەبینێ

لە دووربینی کەشتیواندا

پاپۆڕی شەڕ و تۆفانی باشووری ڕۆژهەلاتی

لە خرۆش دایە

خاتوون،

زرێ بپۆشە و

خۆت بە لووتکەی شاخەوە هەڵپەسێرە

بە ئەستێرانی ئاسمان

سێ کۆڵ شەڕ ساز بکە و

لە نێوان باڕووت و گوللەدا سیمای مریەمیان لەسەر دانێ

ئەو شوانانەی بوونەتە حە*واری*

گازەنگی سۆفیای پیرۆز لێ دەدەن

دار زەیتوونەکان

وەکو کیژۆڵەکانی شوانی مەقدوونییە بە گردەکاندا هەڵدەگەڕێن

مردووەکان
لەسەر پلیکانی کەنیسەن و بە رۆنی چرای روخسار
ژەنگی تۆپخانەی خۆیان دەشۆنەوە

١٦

وست!
سێ قفڵ ـ مان لە دەرکەی ڕەزەکان داوە
بێدەنگ بە خاتوون
دەلاقەی ئەستێرەی شەو دابخە
لە بن بەرهەڵبێنەت دوازدە کلیلی شەو نیهان کە
زرێپۆشەکان بە بەردەرکی ماڵێدا تێپەڕ دەبن و
بەدەوری گەرمەشانییەکاندا
دیوارێکی ئاسنی هەڵدەپەسێرن
دایکمان ئینجیلی بێدەنگی بە سینگەوە دەگوشێ
لە تاریکانی ماڵێدا
کەشەفی زێوین
وەکو بووکێکی دەریایی مردوو ترووسکەی لێ ڕژاوە
زۆر لە مێژە
جامە مسییەکان بەدوور لە مسگەر
لەسەر تاقەی ژوورێدا
ئەرخەوانین
وەکو مانگی قاقڕ

زریێ پۆشەکان تێپەڕ دەبن و
لە ئاسندا جام و جەڕەی ئێمە حەشار دەدەن.
وست!
یەخدانە نەخشینەکان بەرد هەڵگەڕاون ـ
جلی مەلەوانان، کورتەکی زێڕ چنراو، گۆرەویی سپی،
زەنگاڵ، میرات و رەگەزە کۆنەکان!
قەڕتاڵەی پڕ لە تۆوی گیا ـ
گەمییەکی بچووك ئاوێزانی دیوارە
ئەو وێنانەی بە شێوەی دڵ بڕدراون
پڕ ڕستەی پڕ لە دڵنەوایی بنەماڵە،
ئیماندارە دەریاییەکان لەسەر سەدەف نەخشێندراون
گشت هەوای ژووریێ بە دەوریانەوە
دوو تاجی بووك پڕ شکۆفە لە لیمۆ
جووڵەی ئەو شتەی بن بێدەنگی
قالۆنچە نییە
ماری پیری دەستەمۆیە، سینگی هەڵپەساردووە
بەڵێ زریێ پۆشەکان تێپەڕ دەبن بە پێی ڕەش و
هەنگاوی ڕەش
ئەوان مەنجەڵی ڕەشیان پێیە
تاکو باخەکانمان ڕەش هەڵگەڕێنن
ئاوەکانمان ڕەش هەڵگەڕێنن
نانەکانمان ڕەش هەڵگەڕێنن

مانگ لە کەنار ڕێگا

وەکو گالیسکەیەکی سەهۆڵینە

گاسن وەکو پاڕانەوەیەك

هەڵدێراوەتە نێو دڵی دەشت

قوڵینگ بە سەر درگانەوە دەپاڕێتەوە و

مەزراکانمان بە داسەوە هەڵسووڕاون

باپیرە دڵی خۆی قەد دەکا

وەکو نانی دوای بەهار

کە لە دەسرەیەکی دەپێچێ

یان وەك ئەو ڕاوچییەی

پاکەتی بارووت و گوللە قەد دەکا

پێش تیپەربوون بە جەنگەڵدا

لەوێکانە

لە بەستێنی دەریا، نسێی پاپۆڕێك

ئارام و تەنیا تێپەڕ دەبێ

وەکو دڵۆپێ ڕۆن لەسەر پارچەی پەشمینی ناکامییەکان.

***

## بیچمی غیاب

١

ئەوەی ڕۆیشتووە لێرەکانە، ڕەگاژۆیەتی لە شوێنی خۆی،
مات و بێدەنگ
وەکو گوڵدانی گەورەی ماڵی کە دەبووایە بۆ پێویستی بفرۆشرێ
لە سووچێکی ژوورەوە، شوێنی گوڵدان،
تەوژمی فەزای چۆڵ،
هەر بەو شێوەیە وەکو خۆی تژی دەمێنێتەوە
لە بریسکانەوەی ڕووناکییەکاندا کاتێ پەنجەرە ئاوالا دەبێ،
ڕوونییەکەی گەش دەبێتەوە
لە نێو ئەم گوڵدانەدا کە زاتی خۆی لەگەڵ زاتێکی هاوشێوە و
هاوکێش
لەگەڵ فەزای چۆڵ گۆڕیوەتەوە
هەر لە قووڵاییدا لەگەڵ زایەڵەیەکی ژاناوتر، دەمێنێتەوە
لە پشتییەوە ڕەنگی دیوار تۆختر، قووڵتر و کۆنتر ئاشکرا دەبێ
دەڵێی نسێی گوڵدان بەسەر گۆرەوییەکدا کەوتووە
زۆر جار شەوانە لە کاتێکی خامۆش
یان بە درێژاییی ڕۆژ، لە نێوان توێژێك
مرۆڤ لە ناخی خۆیەوە، زایەڵەی دەنگێکی نزم و تاڵ دەبیستێ
دەڵێی ئەنگوستێکی نادیار
هەست بەم پێوانە ون و کریستاڵییە دەکا

٢

منداڵە مردووەکان قەت ماڵی خۆیان بەجێ ناهێڵن و

تێیدا دەگەڕێن، ئاوێزانی داوێنی دایکیان دەبن

کاتێ چێشتیان بۆ ساز دەکا و گوێ دەسپێرێ بە قوڵتەی ئاو

دەڵێی خەریکی خوێندنەوەی یاسای هەڵم و زەمانە، دایمە لەوێ و

ماڵێ قووڵاییەکی تری دەوێ

دەڵێی لە چلەی هاوینە و بارانێکی خامۆش

بە مەزرا چۆڵەکاندا دەبارێ

منداڵە مردووەکان ناڕۆن، دەمێننەوە

ئەوان بە ئاشکرا هەست دەکەن بە سەربوونی کایەی نێو ڕێڕەوی

مەحکووم

هەموو ڕۆژێ لە دڵی ئیمەدا گەورەتر دەبن

ئیتر لە سنگی ئێمەدا ژانێك لە گەڕ دایە

بۆ نەبوونیان نا،

بەڵکو لەبەر بوونی هەمیشەییانە و ئەگەر ژنان لە هاواری نێو

خەو دابن

وا هەست دەکەن بۆ جارێکی تر بە ژانەوەن

... ... ...

زۆر جاران لە شەوێکی بەهاریدا منداڵێك هەڵدەستێ و بێ هۆ

دەڕوا

بێ ئەوەی سەرکۆنە بکرێ، بێ ئەوەی بیلێ

بە ئەسپایی هەڵدەستێ لەو شوێنەی پێشتر بە هێمنی لێی دانیشتبوو
ئەم شوێنە تێنی ئەو دەپارێزێ
لە نێو هەوای فێنکدا بیچمی گیانی هێشتا زایەڵە و
لەبەر تەوژمی سوورهەڵگەڕان بەدیهاتنی سپی منداڵێکی تر تەواو دەکا
لەو دەورو بەرە دەڵێی مێگەل ئاگرێکی سپییان گەمارۆ داوە بۆ گەرم بوونەوە
کەمێ ئەولاتر، سپی ئەسپێکی گەورە، تەنیا
کە لە ڕۆشنایی ئەستێراندا سەرنجڕاکێشە
سەری هەڵپەساردووە و
ڕۆندکی گەش دەبارێنێ

٤

زۆرجاران دەسپێکی شەوە و ماڵ چۆڵ و هۆڵە
دایکان بەرهەڵبێنەی خۆیان لەسەر کورسی دادەنێن و
دەرکەی کمۆدی منداڵە مردووەکانی خۆیان ئاوالا دەکەن
دەڵێی دەرکەی تەسلیم و
دڵمەندیی شاراوەی خۆیان دەترازێنن
دەڵێی ئەوان دەرکەی بێ دەنگییەك دەکەنەوە کە بەرەو ئازارە
ئەوان ئەستووندەکی جلی شینی بچووك و لیمۆیی هەڵدەگرن

لە پڕ ئەندێشەترین کاتەکانی ڕۆژئاوادا دووراون
تۆزو خۆڵیان دەتەکێنن
نیگەران دەیانلاوێننەوە و
لەپڕ پێ دەکەنن
لە ڕۆژێکی ئاوادا کۆرپەی ئەوان گەورە بووبوو
دەبوو لە بیری جلی نوێ دابووایەن
ئەو پەڕۆیەی لەسەر عەرزی دیوەکەدا لەبیر چووە،
پاپۆڕێکی بچووکە
کە بە درێژایی ڕۆخی دەریادا تێپەڕ دەبێ و
چراکانی خامۆش

٥

شەوانی هاوین، کاتێ باخە میللییەکان دادەخرێن
ئەو کاتەی کچانی کەم تەمەن بەرەو ماڵ دەبنەوە
لە گەڵ مامۆستا و خوشکە بیچکۆڵەکانیان کە لە گالیسکەدا
خەوتوون
کیژۆڵە مردووەکان لە ڕیزێکی کپ و نادیار
بەدوایاندا دێن
ڕەنگ پەڕیو، بە زولفی بۆزەوە و لە نێو دەستی پێکەوە
گرێدراویاندا
چەپکە گوڵی ویشکەهەڵهاتوویان پێیە،
وەکو ئەو کورتە شیعرانەن کە دەرفەت نەبوو لەبەر بکرێن

ئەوان لە دوورەوە وەستاون
دەڕواننە تاجە گوڵینە و لەیستۆکی ئاوێزانی نێو کیوسکەکان و
ویترینی بچووکی خەرازی هەمبەریان کە
چراکانی دەئایسێ
بە هەر هەنگاوێك فەزای ئاشنایەك جێ دەهێڵن
هەر هەمان کات بە نسێیەکی سووری تۆخ دادەپۆشرێ
ئەوان دەگەنەوە بەر دەرکی ماڵێ
لە پەنجەرەی داخراوی هۆدەی منداڵانەی خۆیان دەڕوانن
دەست هەڵدێنن بەڵام لە هیچ نادەن
ئەوانی ماڵێ دەنگی دەرکەیان دێتە گوێ
هەوڵەکانیان لەسەر مێز دادەنێن
وەکو گەڵایەکی وشکهەڵاتووی گەورەی بەردەبێتەوە سەر زەمان
ئەوان دەرکە گاڵە دەدەن
کەس نییە تەنیا ئەستێرە سیس و
ئاسمانی چۆڵ و دنیای بەتاڵ دەبینن
دیسان دەرکە دادەخەن، دەڵێی دێنەوە لای منداڵەکانی خۆیان

٦

هۆدەکان لە گەمارۆی نسێی مەزنی خۆیاندا،
قووڵترن، لە ئینتیزار دان یان
سەرقاڵی تەدارەکن
ئەو شوێنەی چۆڵ کراوە غیاب نیشان دەدا

وەکو نەبوونی هەوا کە هەوا دێنێتەوە یاد
کونی کەپۆ دەکرێنەوە
وەکو لمبۆزی سەگێك کە لە نێو جەنگەڵێکی تاریك و لەڕێی
چڕی نسیّ و پڕ ڕووداودا
بە دوای بۆنی شوێن پێی خاوەنەکەیدا بگەڕێ
دەڵێی وەستانێك لە گەڕ دایە، ئەو کاتەی بێدەنگی مۆسیقا
ئیزن دەدا ئەوەی پێشتر هاتبێ بناسرێ و ئەوی دواتر
تێگەیینێك بێ گوماناوی
کاتێ ئارشەکان لەسەر تەڵی وایەلین ڕادەمێنن
چەند پارچەی بێدەنگییەك دەور دەکەنەوە
تا چەند ساتی تر پێشکەش دەکرێ

٧

بەهاران گشت شتێ دیسان لە ئاوێکی شیندا نوقم دەبێ
تەنانەت شووشەکانی نێو ماڵی تازیەبار دەسڕن
گەسك بەڕێزێکی زیاترەوە لە قوژبنێك دەمێنێتەوە کە
تایبەتە بەوێ
دوو پەڕەسێلکە هاتوونەوە بۆ سەربانی ئێمە ـ
مندالّی مردوو
لە تەدارەکی دوو پاپۆڕی کاغەزین دایە
تا لەنگەر بگرن لە بەندەری بچووکی حەسیریی خۆیاندا
ئەم کاتە دیسان لێوی دایك بزەی قووڵی پێیە

وەکو میزانی تەرازوویەك لەسەرووی زەمانەوە دەجووڵێ
دەڵێی بەو کۆرپە نوێیەی بۆی چاوەڕوانە
بیچمی منداڵی لە دەستچووی دادەڕێژێ

٨

ئەو ماڵانە پیرۆزن کە منداڵی کەم تەمەنیان لێ مردووە
نسێ بەردینەکانی نێو ڕێڕەو هەر زۆر دەبن
جامی فەرامۆشکراوی سەر مێز، جامێکی گڵینە
هەولەی ئاوێزانی بزمار، سلاوێکە لە دوورەوە:
نێوان ئەو و ئێمە مەودا گشت قووڵاییی خۆی دەپارێزێ، شەوێ
کاتێ چراکان خامۆش دەبن
خاڵی سووری جگەرەیەك لە تاریکیی ئاوێنەدا
ئاگری تەنیاییە، منداڵە مردووەکان لە شوێنێکی دوور، لە سێن ژان
لە نێوان دەشتدا دایانگیرساندووە
تەنانەت پیاسەی قالۆنچە لەسەر ڕۆژنامەیەکی فڕێدراو
ڕۆیشتنێکی ماشێنێکی بچووکە کە بە کەلدا تێپەڕ دەبێ و
هەڵگری پەیامێکی ڕەسمی و سەربە مۆرە

٩

ئاوا غیاب لەگەڵ ئێمەیە یان بە تەنیایی ژیان دەکا
ئاماژەیەکی نادیار،
بێدەنگی دەبێ،

هەڵدەدێرێ،

پیر دەبێ

وەکو بوونێکی ڕاستەقینە ، بەم بزە خامۆشەی

هێور هێور

چرچ و لۆچی بە دەم و چاو دەبەخشێ

بوونێکە بە کاتی ئێمە

لە هەمانکاتی رەنگەکانی دەدۆڕێنێ، نسێی باڵا دەکا

دەژی و لەگەڵ ئێمە پیر دەبێ

لەگەڵ ئێمە ون دەبێ و

لەو شتەی ئیمە بەجێدێڵین، دەمێنێتەوە

ئێمە دەبێ وریای هەرکام لە ئاماژە و ئەندێشە و

وتەکانمان بین

چونکە لە ئیستاوە تەنیا ئێمەین بەرپرسی

هەرچی بەسەر ئەم غیابە بێ

١٠

کیژۆڵە مردووەکان نەگۆڕن،

هێڵی ڕەپی سەر ڕوخساریان ئاشنامانن

بەدوای گۆڕانی رواڵەتیی ئەوانەوەین

ـ تەنیا شوێن پەنجەی زەمانە نەك مردن ـ

ئەوان لەم باخەی تر، لە توێی پژوپۆدا

ژیان دەکەن

زاریان کپترە لە رابردوو
لە چاویاندا
نسێی توورەی ئەندێشەیەکی زوو پیگەییو
لەمپەرە بۆ بریسکانەوەی گوڵ و ئەستێران
ئێمە پێ دەزانین ـ فەرمانی مێردی داهاتوو بۆ چێشت لێنان و
راخستنی پێخەف، بیری ئەوان ناشڵەژێنێ
لە کاتی بەشداری لە یەکەم کۆڕی سەمای خۆیان تەنانەت بۆ
جارێکیش لە دوای ئەفسەرێکی ڕازاوە
نایە
کە لێیان نزیك بووەتەوە
تا بە ئێستا دوگمەی زێڕینی یونیفۆڕمی ئەو دەست لێ نەدراوە
بەڵام کچان، تەنیا، عازەب، بەرچاو
تا سەر وەفاداری ئێمەن
کاتێ پیر بین و سۆمای چاومان کز بێ
ئەوان هەر لەوێ دەبن
هەتا پیلمان بگرن...
ئێمە پێکەوە دەچینە سەیران
رازگۆ
خامۆش
بەرزەدەماخ
بەڵام بە بێدەنگی و بەرزە دەماخییەکی جیاوازەوە
تەنیا بە ترپەی پێی ئەوان

لە خۆماندا هەست دەکەین بە ڕەنگی ئاوابوون و
عەتری باخ

### ١١

کیژۆڵەیەکی بوێر لە بەرامبەر فرتوفێڵ، لە نەکاوی شەوەژانێکدا
خۆی سەرسووڕماوی بینیوە
ژیان چ بووە؟
ئەی ئەم ژانە؟
ئەم هاوارە؟
ئەمانە هەمووی زادەی ئەون؟
ئەمانە هەمووی لە توێی پێکەنینەکانی
وەك مەبەستێکی فێڵاوی لە کەمین دابووە
ئەی ئەم سیما خۆشەویستانە کە بەسەریدا شۆڕدەبنەوە و
هەنووکە لێی دوورن؟
ئاوا بوو ئەو بە نەرمی، دەرکەی ئەستێرەیەکی ئاواڵا کرد
بۆ ئەوەی نەبیستین
بە ئەسپایی هەنگاوی نا
بە شنەی هێقە هێقە لاوازەکانی
ئەم دەرکە ئاواڵایە پێك دادەدرا
ئیتر ئەو نەیدەتوانی دەرکە داخا
ئێمەش نەمانتوانی
پێوەی بدەین (دوور بووین)

١٢

ئەم ژوورە بووەتە چاڵێکی قووڵ

چرا،

ئەستێرەیەکی داکوتراوە لە نێو ئاودا

پێخەفی منداڵ لە شوێنی خۆیەتی،

مەلافەکان بۆ هەر ساتێك بریسکانەوەیەکی گەڕۆکیان هەیە

لە حاڵێکدا کاتە بەکاوخۆکان، سووك، وەکو کا ـ

دەکەونە سەر سفرە و

ئاڵقەی نادیاری لەسەر ڕەسم دەکەن

لە ژوورێدا کەس نادوێ، ئەگەریش بدوێ

کەس نایبیستێ

کە پەرداخێك لا دەکەوێت بێ چرپە بۆ سەر بێ دەنگی

هەڵدەدێرێ،

ناچرژێ

تەنیا هاواری کۆنی جیایی کە لەگەڵ ئاو ئاوێتەیە

چاڵاو قووڵ و تاریکتر دەکا

١٣

شەو ـ تاریکییەکی نەگۆڕ و بەستەڵەك

چاوان و زار قفڵ دەکا

بازۆڵە هەڵنایەتەوە، قاچ ناجووڵێ

هەموو شتێ سازکراوی ڕەشاییەکی چڕ و پڕە

تەنیا خاچێکی مەڕمەڕینی بچووك كە نێوتی لەسەر نووسراوە
درەوشانەوەی لەشەو  دایە ـ قەبرەغەی سپی درەختێکی کەوتوو
کە ئاوی بیرەوەری پێدا هەڵدەگەڕێ
لقە ناسکەکان و
پیتەکانی ناوی تۆ، دەجووڵێنێ

**١٤**

ڕۆژ بە نیوە بووندا تێپەڕ دەبێ
بەڵام ڕۆژێکی بەستەڵەك چۆن دەتوانێ
تێپەڕ بێ؟
ئەستێرەکان،
ئامپول و سوورەنگی شەوی ڕابردوو، تێپەڕبوون
بە شێواوییەکی بە ژانەوە لەسەر بەردچنی نەخۆشخانەدا بڵاو
بوونتەوە
ئەم نیشانە سوورە ناخی نووقم بوونە
تەواوی شەوێ لە ناخەوە هاواری کەسێك باڵا دەکا: هاوار؟
کچی گشتیان لە نێو پێخەفەکانیاندا مردوون ـ مردووانێکی ئەم
هاوارە دەبیستن و
ناتوانن ڕابکەن
ناتوانن خۆیان فڕێ بدەنە نێو نوقم بوون
تا ئیتر کپ دەبن
ئەم هاوارە هاواری کۆرپە مردوویانە ـ ناتوانن خەیانەتی

پێ بکەن
دەبێ گوێیان لە دەنگی بێ و نەمرن
بە مەرگی ڕۆژانە نیگای کۆرپەکانیان بپارێزن.
دەڵێی بۆ ئەوەی نیگای شین، تۆخ و خەمناك هەڵنەگەڕێ
دەبێ هەرکام لەم ژمژیە و کارەکانیان پیرۆز بێ

١٥

گەرچی دایکت هیچ نەدوێ، باش دەزانێ
هەموو شتێك بە ناچاری چەماوەتەوە
ئیتر هیچ شتێك نییە ...
ڕاست
بێ تاوان و
زیندوو
شەممە شەو، سەری داگرتووە بە سەر مێزی چێشتخانەدا
هەست پێ دەکا بەسەر فەزای بە تاڵدا شۆڕ بووەتەوە
بەڵام پێ دادەگرێ
خەرجی حەوتوو بەراورد بکا
بۆ ئەوەی کەس پێ نەزانێ
دیسان ورد دەیژمێرێ
بە وردبینییەکی وەها ژاناوی کە هەموو وەردەسورێنن و
خۆ ببوێرن
ئەم هەموو پرتەقاڵەی تایبەتی منداڵان بووە و

دەست لێ نەدراون
لە ئاوا بوونێکی نامۆدا کێوێکی زێڕینی بچووکە و
بە دوندیەوە ئالآیەکی بچووکی پرسە،
خامۆش و ون دەشەکێتەوە

## ١٦

لە ماڵێدا نسێکان  زۆر زوو باڵادەکەن، تەنانەت
پێش کوژانەوەی ڕۆژ
پێش ئەوەی دەنگی منداڵانی تر خامۆش بێ
ڕیش و نینۆکی پیاوان زوو زوو دەڕوێن
سابوون کەف ناکا
ئاگر ئیتر بە تین نییە
چینەکانی کراسی  ژنان
قووڵتر و تۆختر بوون
دەڵێی تێیدا بیرەوەریی خامۆش و سیس خۆیان حەشار داوە
بەڵام ژنان نانی خۆیان  هەر ئامادە دەکەن
چێشت دایمە زۆرە و
گەڕیانی دەنگی نان لە زار دا
بێدەنگی ئازار چێشتووە کە ئاخ هەڵدەکێشێ و
بۆ لای تر دەڕوا

١٧

کاتەکان تێپەڕ دەبن

ئارامییەکی قووڵ

سەیر،

بەردەبێتەوە نێو ژوورەکان

دەڵێی لەنگەرێکی گەورە، سەرنجڕاکێش

لە ناخەوە هەستاوە و

سنوورەکانی ئەوبەر بێ نیگابان

بەڵام تۆ نەڕۆیشتووی، تەنیا ئێمەین بە سنووردا تێپەڕیوین

بێ وەرسووڕان، لە پشت سەرمانەوە

هەستمان کردووە بە هەنگاوە نەرمەکانمان

کاتێ لە نێو رووناکییەکی خەمیندا،

بەستێنی ڕووت و بەرین لە ناخماندا رادەخرێ

لەسەر لمی نەرم و تەڕ

هەزاران خاچی بچووکی لاقی باڵندە دەریاییەکان بە جێدەمێنێ

کە بێرەدا تێپەڕیون و بێ ترس بۆ ئەو بەر چوون

١٨

ئەو سەردەمانە بەسەر چوون

لەسەر بەردی دیمەنە نەناسراوەکان چیها

پێڵاو سواون

گەرچی دووەم جار درەختەکان بێ بەرن

لە غیابدا زەمان ئاوێتەی مانەوەیەکی تر بووە
لەم هاتوچۆیەدا وەرزگەلێکی زۆر تێکەڵ بەوانی تر دەبن
هەنووکە بە هەڵوێستی بەرین مەرگی ئەوان دەژمێرن و
مردووەکان هێدی،
زۆر هێدی بالاّ دەکەن
ئەوان ناتوانن بمێننەوە
لەیستۆکی تۆ هەر لەخۆوە لە سەر پێیە و خۆی بۆ ئاسمان
گوێزتووەتەوە
کورسیلەی منداڵانە لە شەوانی هاوین
بووەتە کۆی ریزی ئەستێرەی سەرسوورهێنەر
چەندەها سەدەمان پێویستە تا دیسان لە ژوورەوە بۆ حەوشە
کۆچ بکەین
ئەم سەدانە بە ژیانی ئێمەدا تێپەڕیون و
ژیان ڕۆچووە
لەو کاتەوە هەرچەشنە جووڵەی دایك
کاتیّ مێز کۆدەکاتەوە
کاتیّ دەستێك بە پێخەف دادەنیّ یان
لە کاتی پینەکردنی گۆرەوییەك
کپ دەبیّ
دەبێتە هاوڕێی نسێیەکی بەرفرە و ناوەڕاست
کە بیچمی خۆی بەسەر گومبەزە گەورەکاندا دەکێشیّ
دەڵێی رووناکییەکی پێچەوانەوە ریّ دەپێویّ و

هەموو شتێ

لە خوارەوە بۆ سەرێ

لەناخەوە بۆدەرێ ڕۆشن دەبێ

**١٩**

خەڵکە گەورەکان تەواو بچووك بوونەتەوە،

لە گۆشە و کەناری زەماندا

ئەژنۆ لە باوەشن

وەکو منداڵێکی سەرکۆنەکراو و بێدەنگ

لە نێوان دوو مجری کۆنی پڕ لە جلوبەرگی زستانی ماونەتەوە

گەورەکان تەنانەت لە فەرامۆشی ئەلف و ب...ێ دان

چ ناتوانن بخوێننەوە

ژنان ئیتر نابینن و چ ناتوانن بینین

شەوانە کتێبی پیرۆزی گەورەی تۆخی خامۆشیان بە دەستەوە

روخسار دادەپۆشن و

بۆ ئەوەی نەگرین لە پیتە نامۆکان دەڕوانن

هەوڵ دەدەن لەم سەر هەتا ئەو سەر بیخوێننەوە

دەڵێی شەوێ لە پشت پەردەچیغی  ماڵێکی چۆڵی گەورە

لە سیمای درەوشاوەی منداڵێکی نێو حەوشەی زەمان دەڕوانن

کە

لە شوێنێکی دوور، لە مەزرا بەرینەکانی هاویندا

بزر بووە

لەبەر ئەمە گەر بە وردی سەرنجی ژنان بدرێ
لە نێوان هێڵی ڕووناکیی بەخشراوێکی دوورە دەست
شوێن گەلێکی ئاسۆیی و
تاریکی پەردەچیغییەکان
کەوتوونەتە سەر ڕوخساریان

٢٠

هەموو لە تۆ دەڕوانن ـ تەنانەت کاتێ وا دەنوێنن
لە ژنان و رووناکی دەدوێن
تەنانەت کاتێ وا دەنوێنن نیگایان بەرەو میچە یان
نیگەرانی ئەو پێڵاوە دلۆڤانانەن
کە شێوە خۆ پەسندییەکی تۆزاوییان لێ نیشتووە
لە پشت چاویلکەی سەر مێز
بە دوو چەشنە بریسکانەوەی ئاشکرا
نیگای خوار و تەواو لێڵی بۆشایی دەبیندرێ کە
ئاوێتەیان بووە
بەم شێوەیە بە خێراییەکی دلۆڤانەوە، وریان ئەویتر بلاوێننەوە
تاقەت پڕووکێنترین کار هەڵبژێرن
بەڵام لە دەرەوەی ماڵ دەنگی گریانی منداڵێکی تر
وەکو لقێکی ڕووت و تەڕ، لە ڕوانگەیەکدا بەرفرە دەبێتەوە
کە هی تۆیە و لە هەنووکە بە دواوە
تاراو بۆ پایزێکی بێ پایان و دڵتەزێنی دوایین رەنگ پەڕیوی
ماڵی خۆت

## ٢١

لەو کاتەوە ڕۆیشتوویی هەموو شتێ شوێنی گواستووەتەوە
ئێمە نامۆین
بە ڕۆژ و شەو
لە ناخی ئاوێنەکاندا دەنگی پڕ ئازاری سەوڵە تۆخەکانی ترس
ڕادەپەڕێ
ترس هەست بە ژانە لەسەر ئەو ڕوخسارانەی ناناسرێن و
پشت تێ کراون
ترس لەوەی
لەسەر سیمامان گشت ئەو شتانە ناناسرێنەوە
کە تۆ دەتناسین و
هی تۆ بوون و
هی ئێمەش
کە شەوانی هاوین تۆمان دەگەڕاندو
تا وێستگە بیچکۆلانەکەی ئەوێ دەچووین
کە بە بەر گوڵفرۆشی و نانەواخانەدا تیپەڕ دەبووین
تەنیا ڕێیەکی هەبوو
ئەمێستاکە هێڵی بەجێماوی کالیسکەکەت دەپارێزێ
وەکو ئەو ژێر خانە پڕ هەڵڵا و بگرەی رابردوومان
کە دەنگی کورتەباڵای باڵندە و
بۆنی میوە و

جنێوی بازاڕییەکان پاراستوویانە.
پانتاییییەکی سەر بە مۆر و
تانە هەڵنەگر و پیرۆز
ئەو شوێنەی کە تەواو هی ئێمەیە  و پەڕیوە لە زەمانە
ژێر زەمینێك
کە بە شەوباشی ژیرانەی خەڵکی گەڕەك دەرکەت لێ دەکاتەوە

٢٢

نا، تۆ نەڕۆیشتووی، بەردەوامی لێرە
لەگەڵ تەختە بیچکۆلانە  و کورسی و کالیسکەکەت،
لەگەڵ هەرێمی
بێ پایانی یەکەم وشەکانت
لەگەڵ ڕووخۆشییە ڕوو ڕاستەت
کە بەردەوام لەگەڵ بەرد و گوڵ و باڵندە بچووکەکان
دەدوای
... ...
تۆ نەڕۆیشتووی، بەردەوامی،
نوقمی کایەی لەگەڵ تیشك و لەیستۆکەکانت
ئێمە کە بۆ شوێنێکی تر ڕۆیشتین و
سەرقاڵییە بێ ماناکان، هەلاّتنە جۆراوجۆرەکان، ئیشی دادگا و
تابلۆی دووکانان
لە درەنگیدا ڕامان دەگرن

هەمیشە هەست بە درەنگ بوون دەکەین و تۆ چاوەڕوانی ئێمەی
هەرچەند گەڵاکان و ئاژەڵی دەستەمۆ و شتومەك
لە دەورەی تۆ کۆ دەبنەوە
تا بەشداری تەنیایی روونی تۆبن
تۆ لە کاتی نەبوونماندا
بە یارمەتیی جامێك،
بورجێکی بەرز و روونت هەڵپەساردووە
تۆ چاوەڕوانی ئێمە بە پلیکاندا سەر دەکەوین و
بەتۆ پەیوەست دەبین
هەتا لەگەڵ ئێمە لە یەکەم ئاکارە درەوشاوەکانت چێژ وەرگری،
بەڵام ئێمە
لە درەنگی داین بۆ هاتن

٢٣

لە ماڵێ کەس نادوێ
هیچ کەس توانای درکاندنی وشەی نییە ـ هەموو لە شتێکی تر دەدوێن
لە ئەندێشەیەکی دیکە دان، بۆ شوێنێکی تر دەڕۆن
لە ڕێ لا دەدەن نەکا پەلاماری رۆحانەتی متی فەزا بدەن
پیاوان و ژنان لە رێدا مردن
نەکا گوێیان لە دەنگێکی دیکە بێ
نەکا ئەو برینە نیهانانە بێدار بکەن

کە لە پەنای شتومەك و
لە ژێر توێژی دیوارەکان و پشت پەردەکان خەو دەیانباتەوە
تەنیا ژنان جار نە جارێك ئاخێکی قووڵ و خامۆش هەڵدەکێشن
لە هەمبەر لێوەکانیاندا فەزایەکی بێ لەمپەر و
بوغێکی سپی ئاشکرا دەبێت و
تۆ دەبریسکێنێتەوە
تۆ وا دەزانی لە کەفی سابوونی وانە بیچکۆلانەکەت دای
یان سواری سپی ئەسپێکی دارینەی بچووکی
کە لە دوای ڕۆیشتنت لە نێو دڵی بێدەنگیدا غار دەکا و
زولفە نەرمەکانت لە هەمبەر دەرکەی ماڵێدا ڕادەوەشێنێ.

٢٤

شەوێ لە ڕێی کۆڵانە هەزار بە هەزارەکانی نامۆی شار
کە رووناکی ژمژیە و پڕ سەرنج یان دەم ڕاستییان بێ هەواڵی ئێمەیە
دیسانەوە بەرەو باخچەی نزیکی وێستگە دێینەوە
کە فوارەیەکی مندالانە و مۆسیقایی
سەردەرانەی کورتی ماڵە هەژارەکانی رووناك کردەوە
ئەم ساتەیە لە شەوێکی بەهاریدا کاتێ تۆ لە کالیسکەکەتدا خەوتبووی
دایك و بابت لە گریاندا مابوونەوە
تا لە بەرامبەر خولقاندا خۆیان ئەندێشە بکەن

ئەم کاتە خامۆشیی فوارەیە، گۆڕێکی چۆڵ بوو
تا بیرەوەریی ئاوە خامۆشەکان و
بزەی تۆ کە نەختێ بیچمی داڕێژرابوو
لەوێدا ئارام بگرن

٢٥

مەودای نێوان دەستەکان بەرین بووەتەوە
ئەوانەی یەکتریان خۆش دەوێ ئیتر دەست لەسەر دەستی یەکتر دانانێن
لە ترسی ئەوەی ویشکانییەکی راهیبانە ئاشکرا بکەن
لە ترسی ئەوەی لە دەستە یەکگرتووەکانیان هاوار غیاب راپەڕێ
ئەوان هەروا لە قوولاییی میچی ژێر هەیواندا
دەمێننەوە و لەو پەڕی زەمانەوە
ڕەنگە لە مێزە پەڕیوە و بێ میچەکان بڕوانن
کە لە بێ دەنگییەکی قورسدا دەگۆڕێن
تەنیا لەسەر کمۆد (دۆلاب)
سەعات وەکو چاوی منداڵ، بە ڕووناك بینییەکی زۆر و چاوێکی بەرین
بە کاتی زەمانێکی نزیك یان دوورە دەست یان ڕابردوویە مەرگ
هێور هێور وەکو لێبوورانێکی بێ سوود، خەسار دەبێ

هـاوین لـەبـەر دەرکـەوە بـەرەو کـۆڵانـەکـانـی بـەرامبـەر ڕۆیشت
بێگومـان پـاسکیل و مـاشێنـەکـان بـەرەو بـەستێکـی دوور
دەڕۆیشتن
بێگومـان، کـاغـەزی کـەسکـی نێو ویتـرینـی دووکـانـان
بـە تینـی هـەتـاو ڕەنگیـان دۆڕاند، ئێمـە نـەمـان دیت
لـە پـاپـۆڕو قـەتـارەکـانـەوە هـاودەنگییـەك بـاڵای دەکرد،
هیـچ دەنگێك
دواتر بـاران
مـاڵێی رامووسی
بـە نـەرمـی و دۆستـانـە لـە ئـامێزی گرت
شووشـەکـان بـە هـەڵم داپۆشران
ئـەو کـات لـە دەرەوە، ـ نـەك لـە ژووریَ ـ ئـەنگوستێکی منداڵانـە
تـەنیـا و نـەختـیَ خـەمین
لـە سـەر شووشـەکـان، دڵێکـی نـاسك
لـەنگـەرێك و قوویـەکـی نـەخشـاند
لـە نێو ئـەم بیـچمـانـەدا، تـەنیـا ئـەو بیـچمـانـە روونـاك بوون
دیسـان ڕۆژی جـارانمـان دیت
لـە دەرەوە کۆم و خووسـاو تێپـەڕ بوو
ستوونـە کریستـاڵییـەکـانـی بـارانـی کۆڵکێش دەکرد
تـا لـە کۆتـایـی و زەمـاندا

میحرابی خەم هەڵپەسێرێ
سات لەگەڵ سات هەواڵێك، هەر هەموویان بە شێوەیەك پێوەندی
بە ئێمەوە بوو
ئەستێرەیەك، لقێکی زێڕینی ڕادەتەڵەکاند و ون دەبوو
مستێك خەوی هێدی و خامۆش لەسەر پێخەفەکان
گەر هەتاو هێور هێور باڵای دەکرد
نسێی بەرزەباڵای کوێستانەکان کۆم دەبووەوە و
خۆی دەخستە ناو دەشتی شێدارەوە
ئەو ریزە مۆتەکانەی جووڵانەوەیەکی هاوئاهەنگیان بوو
رەنگ و بیچمیان بە خۆوە دەگرت
نەختە ڕووناکییەکی پینەکراو لەبەر دەرکەکەمان ڕادەوەستا
ئەم ڕەشێنییەی شەوانە خۆپارێز و دەستکرد
تەنیا جەڕەی دڵپاکی بوو لە پشت پەنجەرەوە
کە شەو دیسان دەهاتەوە
نانەواخانەی دادەخست، کیژۆڵەی میوە فرۆش، هاوتەمەنی تۆ
لە چوون بۆ شەو خۆی دەبوارد و دەگریا
سیمای تۆ وەکو پەڵە هەورێك
شەلاڵی رووناکی
هەنوکەش خانووەکانی دەوروبەری باخچە و دار تەلی تێلگرافی
گەڕەکەکانی
رووناك دەکرد

٢٨

لەم ماڵەدا گەر کەسێك پێی خۆش بێ، بدوێ:

ـ لە بارەی تۆوە، نا ـ وتەیەك لەبارەی بنەماڵە

سواری ئەسپ، پێداویستییە بچووکەکانی ڕۆژانە

لە ناکاو مت دەبێ و

دەنگی دەلەرزێ

وەکو تەنافێك کە هەژاران لە دەوری چەمەدانەکانیاندا گرێی

دەدەن و

هەموو توورە و خەمناکن، دەڵێی لە ناچاری دان

ماڵی باب و باپیرانیان بە بێگانە بفرۆشن و بە جێی بێڵن

دەڵێی ناچارن بڕۆنە گەڕەکێکی تر، ڕووناکییەکی تر

بیرەوەرییەکان لە سووچی هۆدەکاندا چەمیونەتەوە

وەکو ئەو کیژۆڵە تەنبێ کراوانەی بە نیشانەی تۆران

بەرەو دیوار بن

ئەو کات ئەوان لەسەر شتومەکە پێچراوەکانیان دادەنیشن و

دەگرین و

هەر لەوێکانە دەمێننەوە

٢٩

زەمان چۆن دەتوانێ هەنگاوی ئاشنای لە پێیانەڕیدا

بدۆزێتەوە؟

خەڵك چۆن دەتوانن لە دەوری مێز دانیشتبێتن و

نان لەت بکەن و بدوێن و
دەنگی کەوچك لەسەر قاپ بێ و چەقۆ لەسەر جام؟
جامیش لە هەتاودا سوور بێتەوە،
لەو هۆدەیەی هەمبەرمان
ژنێك لاقی لە نێو تەشتدا دەشوا و گۆرانی دەڵێ
کیژۆڵەیەکی گەنج لە نێو بەرهەڵبێنەیدا سێ دوڕگەی بەیانی و
شین - ی پێیە
کوڕی بۆیاخچی زولفە تێك ئاڵاوەکانی بەستووە
ئێمە چۆن دەتوانین لێرەکانە سەرقاڵی بینین و بیستن بین؟
چۆن دەکرێ ژیان لە لایەکەوە بیرەوەری بچنێ و لەولا تریش
هەرچی ئەو خاوەنیەتی و
ئەو کارەش بە ژانی جیایی و بە پەژیوانیەکی تەواو ئەنجام بدا؟
چۆن دەکرێ ژیان بەهەموو هێزی خۆیەوە ڕۆژگار بپێوێ
ڕۆژانی خۆی لەگەڵ ئێمە تێپەڕ بکا
تەنانەت هەر بەو بزۆزییە جوانەی خۆی
ئێمە بەو شتەوە پەیوەند بکا
کە زیاتر لە کیسمان داوە و
پرسیاریشمان لێ نەکا؟
پاپۆڕ نوقمی ئاسۆیە
لە پشت سەریەوە فیشکەیەکی بەجێ هێشتووە، وەکو نسێکەی
وەکو پاپۆڕێکی تر کە لە فەزادا مۆڵە دەڕوا
چۆن دەبێ؟

## ٣٠

لە باخچەی منداڵاندا بێشکەیەکی بچووك چۆڵ ماوەتەوە
لە لونا پارك ئەسپێکی  چێوی بێ سوارە
لە ژێر درەختەکان نسێیەکی بیرمەند دانیشتووە
لە رووناکیدا بێ دەنگییەکی دوورە دەست، بێ ئاکام
بەدی دەکرێ
دایمە لە نێوان هەرا و پێکەنیندا بۆشایی هەیە
لەسەر ئاوی ئەستێر، مراوییەکان بۆ ساتێك لەنگەر دەگرن
بە نێوان سەری منداڵاندا، لە پشتەوەی درەختان دەڕوانن
منداڵێك
نادیار، بەبێ دوان تێپەڕ دەبێ
هەر دەنگی هەنگاوە خەمینەکانی دەبیسترێ، ئەو نایە
... .... ...
ئەسپێك لە مەیدانی غار ڕای کردووە
چاوی هەڵدەگلۆفێ و
لەنێو ریزی درەختەکاندا ون دەبێ
رەنگە دەڕوا ببێتە هاوڕێی ئەو کیژەی لە شەوێکی تەنیاییدا
لە سێیەم چوارڕێیانی مانگ
هانای بردووەتە ئەم بن بەستە زێوینە
وا فانووسی کپی پێیە

## ٣١

لە بەیانییەوە، ئاوازی بێ پایانی گازەنگ دێتە گوێ

سەعات١٤، دووکانان ئاوالأن

جەماوەر شەقامەکانیان گرتوو

ئەوان لەیستۆك، مۆمی منداڵانیان بە بەندی شین و

سوور کرپیوە

دایکانی کۆرپە مردوو، سواری ئوتوبووسی گۆڕستان بوون

... ... ...

شەوێ هەوا هێمن

کەنیسەی بەرز ڕووناك

دەروازە لەسەر گازەرەی پشت

خەمی قورسی مردووی تەواو ئەفسانەیی، بای بەهاری

گڕەکانی دەشەکاندەوە

جوانیی تاقەت پرووکێنی دنیا لە خەمی خۆیدا

لە ئامێزی زەماندا

لە دەرەوەی مەرگ و تۆ کە لە غیابدای

ئەوانی قسنە بەر دیان بەڕێ کرد و بۆ ئەو گەڕەکەی گەڕانەوەی

کە بە مۆم و گوڵی ئاگر، سوور هەڵگەڕابوو

وامان زانی:

لە ژێر گوڵە سپییەکان دیسان تۆ بووی

تۆ کە لێو بە بزە بووی بە ئاگا لە خەمی ئێمە

بەو شێوەیە لە شوێنە پەڕیوەکان، لە ریزی ئەسپەردەکردندا
خاچە بچووکەکانی گۆڕستانی منداڵان
خامۆش
بە ئاهەنگی سیماندەر(*)پێ چەقێکان، هەتا بەر دەرکی کەنیسە
بە دوامانداا دەهاتن و
لە پەنای ئێمە لە چاوەڕوانی حەشرێکدا بوون
کە ئێمە ئەو کات لە ناخماندا بوو
دواتر بە پردی بەرتەسکی وێستگەدا تیپەڕین و
بە مۆمە خامۆشەکانمانەوە
بۆ ماڵێ هاتینەوە
قسنە بەرد وەکو گردێك لە گوڵە خەمینەکان بە تەنیا ماوە
هێلکەی سووری جێژنی فەسەح لەسەر مێز نەبوو و
دەرکە نیوە ئاواڵا بە سەر شەو دا

٣٢

ئیتر هیچ شتێك نامانناسێتەوە
بەڵام تۆ، نادیار، لەسەر ئەوەی
لەگەڵ ژیان ئاشتمان بکەیەوە
ئێمە بکەیە هاوپەیمانی..
ئەگەر نیگات لە چاوانماندا بێ
لە ڕوانین، دوان و جووڵانەوە خۆ نابوێرین

(*) لە بەشێك لە کەنیسەکانی یۆناندا بە جێی گازەنگ لێ دەدرێ.

ڕەنگە ئەم گەنجە تۆی خۆشویست بوایە
ڕەنگە ئەم کیژۆڵانە دۆستی تۆ بووایەن
ڕەنگە دوو سبەی تۆ چووبووایەی بۆ ئەم قوتابخانەیە
ئاوا شەوێك دێ
وەك شاربەدەران رادەکەینە ئەوێ
لەنێوان دوو ڕیزی ماڵە چۆڵەکان
لە ژێر چرا کپەکان
وەکو دەستی کەڵەبچە کراو
گوڵدانێکی تەڕ کە لە سەر کۆنە باڵکۆنێ دڵۆپە دەکا
دیسانەوە ئاوازی خۆی بە ئێمە دەسپێرێ،
دەرکەیەکی نیوە ئاواڵا شەو نخوونیمان بۆ دەکێشێ
ئەم کورسییە چێوییە کە لە خودی جیاییدا فەرامۆش کراوە
چاوەڕێ بوو لە سەری دانیشین و
دەیزانی کە لە شوێنێکی دوورەوە
لە کەنار پەنجەرەیەکی تەنیا و مۆڵەق
درووست لەسەر شەو، تۆ
لە پشت پەردەی تیشکەوە، چاوەڕوانی
بزەی ئێمەی...........

ئەسینا، کانوونی دووەمی ١٩٥٨

# یۆنانی خوێناوی

١

تا کەی لە ژێر ڕکێفی ئەم گەردوونە خەملیوەدا
درەختەکان بالای خۆیان هەڵپەسێرن!
تا کەی لە ژێر ڕکێفی سمی ئەسپاندا
گاشە بەردەکان لە شانازی دابن؟
روخسارەکان  هەر لە تیشکی خۆرەتاودا دەپشکوێن
هەر لە زولاڵی عەدالەتدا تینوویەتی پاراو دەبێ
دیمەنەکان وەکو بێدەنگی بێ بەزەیین و
شەکەتی دێنن
گاشە بەردان لە ئامێزی ساردی ئاسۆدا کروشمەیان کردووە و
دڵتەنگن لە نێوان رەزی هەتیو و لقی زەیتووندا
زەوی داپلۆخاو، بە ددانی تێکپەڕیوەوە
دەهاسکێنێ
ئاو هەروا بێ نیشانە
لە سەرنجڕاکێشیی تیشکێکدا ونە ڕێگا
نسێی ئاغەڵەکانیش نوقمی رەنگی ژەنگن
لە هەنگوژەی هەتاودا
درەخت و رووبار و ئاواز

هەموو سپی هەڵگەڕاوی ڕەنگی هەورن
تینوو و سی وشکهەڵاتووی قومێك ئاون
هەموو داپلۆخاو و سووتاو و
بە زارێك پڕ بە باڵای ئاسمان
ناكامییەكان دەخۆنەوە
چاویان لە بەر تەوژمی بێ خەوی، نوقمی خوێنە
هێڵێكی قووڵ لە نێو برۆیاندا
وەكو نسێی سەوڵ لە نێوان گردەكان كاتی ئاوابوونی خۆرەتاو
دەستیان پەیوەستی تفەنگە
تفەنگ درێژەی دەست و
بازۆڵەیان نیشانەی ڕۆحیانە
لە توورەییدا لێو دەكرۆژن
تۆزی خەم لە قووڵایی چاویاندا هەڵدەچێ
وەك بریسكانەوە ئەستێران لەسەر كانیی خوێی ڕەش
ئەو كاتەی مست وێك دێنن هەتاو ملكیانە
ئەوكاتەی بزە لێویان دەنەخشێنێ
هەڵفڕینی پەڕەسێلكە لە سەوزەڵانیی روخساریان دایە
ئەو كاتەی ئارام دەگرن
لە گیرفانە بەتاڵەكانیانەوە دوازدە ئەستێرە دەتكێ
ئەوكاتەی گیان بەخت دەكەن
ژیان بە شەیپوورەوە بە داوێنەكاندا هەڵدەگەڕێ
بە خێرایی

چیها ساڵ له گەماڕۆی دەریا و خاکدا
له قاتیی نان و ئاودا
دەستەو یەخەی مەرگن
به ئاگری خۆرەتاو مەزراکانیان سووتاوه
ماڵەکانیان لەسەر ڕێی هێرشی قاقڕه و
له شەڕگەدا بڵاو بوونەوەی گوڵی یاسه
تۆفان له گەڕدا و لوولەی تفەنگ بەرەو ماڵان
هەر هاتوچۆی مەرگه له نێو جلی شڕیاندا
وەکو میوەی سەوڵ زمانیان تفت و تاڵه و
هەتا مۆخی ئێسکان باران ڕۆچووه
ئەوان له شوێنی نیگابانیدا چوار مێخه کێشراون -
پەینی ئەسپ دەسووتێنن و
شەو دادەگیرسێنن
چاویان به لرفەی ئۆقیانووسەوه هەڵواسراوه
بۆ نوقمی کۆڵەکەی شکاوی مانگ
تۆز له عەمباری نانەکانیان هەڵدەستێ و
تەقەمەنیش له تەواوبووندا
بۆیه ئێستا ڕۆح بەبەر تفەنگ دادەکەن
چیها ساڵ له گەماڕۆی خاك و ئاو دا
له برسێتیدا ئاویلکه دەپێون و لەگەڵ سەرەڕۆیی کوژرانن
کەچی له هیلاکیی هەڵاتن و بۆ جارێکی تر ژیان!
له بەرزایی بورجی نیگابانییەکان دەستیان ئاڵایەکی بەرین

هەڵدەپەسێرێ و
مەشخەڵێکی گەورە دادەگیرسێنێ
لە بۆرەتاری هەر بەیانییەك،
لە هەموو دەستێکەوە باڵگرتنی هەزار کۆتر بەرەو چوار دەروازەی
ئاسۆ

٢

دوایین هەناسەی ڕۆژئاوا
ئەوکاتەی لە ئامێزی گاشەبەردد ا وەرکەمەر لە پاڕانەوەیەکی
بێ ئۆقرەدایە
لە درزی سەدەکانەوە هەمیشە دڵۆپێ ئاو ڕێگا دەبڕێ بەرەو
خامۆشی
زەنگێکیش ئاوێزانی بەرزاییی چنارانە کە هاواری ساڵەکان دەکا
لە نێوان بنچکی گوڵی سپی و ئەرخەوانی دارستانی پیرۆزی
ئاس دا کیژێك ڕاکشاوە
بە داوێنی شەلاڵی خوێنی ڕەزەوە
لە کۆڵان هاواری منداڵێك بەرزە
لە قووڵایی دەربەنددا مەڕێکی وێڵی بەرخەکەی، وەڵامی دەداتەوە:
سێ نسێ لەسەر کانی و کاتێکی سارد لەسەر تەشتێك
کچی ئاسنگەر بە لاقی خووساو
لەسەر مێز گردەنانێك و زەیتوون
ئەستێرەی ئێوارێ لەو پەڕی بالای ڕەزەکانەوە

لەو دوور دوورانە

کاکەشان عەتراوییە

بە سیر بیبار و رۆنی قرچکراو

بڕوانن بۆ دەرزیلەی کاژەکان کام حەریری ئەستێرەی پێویستە

هەتا لەسەر خۆڵەمێشی ئاغەڵەکانی هاوین –

ئەمە بچنن :

ئەوەش دەرکەیە بۆ تێپەربوون

دایکێ حەوت کۆرپەی بە ئازایەتی بەخشیوە

پێش ئەوەی ڕووناکایی لە دۆزینەوەی رێیەکی نێو رۆحی دابێ

تاکەی تەلی دڵی لەسەر گڵکۆی جگەر گۆشەکانی بلەرێنێ؟

ئەم ئێسکانە ڕاپەڕیوە لەم خاکە

هەنگاو هەنگاو هەموو زەوی دەپشکنێ

لە سپێدەوە تا تاریکان

زایەڵەی شەیپوور و ئاهەنگی شمشاڵ

ڕەنجەکانیان هاوار دەکەن و

گلەیی دەباتە لای کاژ و مژمژۆکە و گەمی

وەکو ئەستێرەی قەدەر لە پێشدا گوێت لە زەمزەمەی ـ نسر واقع ـ ە

و

گەمییەوان لە پیاڵەی ئۆدوسیوس تاڵیی زاری دەریا دەخواتەوە

کێ داگیر کەری ڕێگاکانە؟

رق و قینی کامە خەنجەر هێرش دەباتە سەر پشتیوانیتان و

کامە کلیل دڵتان قفڵ دەکا؟

کاتێ بە دوو دەلاقەی ئاوالآتانەوە، دەڕواننە باخی ئەستێرە

بارانی خودا

زەمان لە مەیخانەی سەربازانی پاپۆڕ خۆ دەنوێنێ

وەکو شەوی هەینی لە مانگی مای

بەرینایی شەو وەکو ئاگردانی هەڵواسراو لە دووکانی ئاسنگەران و

هەڵماسین و خۆکێشانەوەی زەمان وەکو گردەنانێك لەسەر

تۆڕێکی هەورین

گردەمانگ لە پانتایی کێرێت بە عیشوە و نازە

لێرەکانە پیاوانێك هەن بە دەروازەی شاری ئاراگۆسدا

هەڵدەگەڕێن و

چەخماخەی تووتنی شەو دەخەنە نێو پیپەکانیانەوە

ددانیان لە ناخی گاشە بەرد و

دەریای شۆرەکاتی ئێژە وەکو دەماری کاژ رەگاژۆیەتی

ئەمانە بە ئاگر و پۆلادا تێ پەڕیون و تێکەڵاوی بەردن

بە شەڕابی کاسەی سەری باپیرانیان چوونەتە پێشوازیی مەرگ و

لە شەڕگەدا لەگەڵ قارەمانانی خولقێنەری حەماسەی دیژنس

دیداریان کردووە

ماوەیەك لە جێژن و لە شادمانیی ئەودا دانیشتوون

وەکو گردەنانێکی وشکهەڵاتووی جۆ

کە بە ئەژنۆی لەت کرابێ

بەشداری نیوەی خەمەکانیان بووە

... ... ... ... ...

وەرە پێشێ!
ئەی کیژۆڵەی مژۆڵ خوێواوی
بە دەستی داپلۆخاو، ڕەق هەڵاتووی خورپەی هەژاری و
ئازاری مانگ و ساڵ!
لە دارستانی پڕ شیرە عەشق چاوەڕوانتە
ماسی گرە بە دەروازەی هێلانەکانیان دا پەیکەرەی ڕەش پێستی
تۆ
هەڵدەواسن و
تووتییە دەریاییەکان خاکی بەر پێت بۆ سورمەی چاوان دادەنێن
لە مەیخانە هێشووی ڕەشهەڵگەڕاوی ڕەزەکان ئەرخەوانی دەبن و
لە ژێر خاکدا رەگی گیان بەختکردووان رەگاژۆ دەکا بەرەو ئاو
بۆ چەکەرەدانی تۆوی ڕۆح
دایکی نێو چاوان گرژ لە مستیدا توند خەنجەر دەگوشێ
تۆش دە وەرە ئەی ژنی سەر گەرای زێڕینی هەورەتریشقە!
. ... ... ... ...
ئاخ...!
بڵێی کەی بە وێستگەی دەریای شین هەڵگەڕاودا تێپەڕ بێ؟
کەی بۆ جارێکی تر بە ئەنگوستی تفەنگەکەت لادەی رووبەند و
چەك هەڵبگری؟
نەعرەتەی شادی مانگی مەی هەستێتە سەر پێ و بە نێوان
برۆکانتدا
تێپەڕ بێ؟

کەی دێ داوێنی هەتاو وەکو داوێنی تۆ لە پشکووتنی هەنار
شەلاڵی سوورایی ئاسۆ بێ؟
تۆو هەتیوەکانت ئاوێتەی ترپەی خۆرەتاو بن و
بۆ جارێکی تر دەریا وەکو لێوی شمشێر و بەفری ڕێبەندان
لە درەوشانەوە دا بێ؟
کەی دێ قرژاڵی کێوی لە حەشارگە بترازێ و
چنگی لە بن پێی سینگی هەتاو هەڵگەڕاویدا گەرم بکاتەوە؟

٣

لێرەکانە ئاسمان ئاوی چاوان هەڵناوێنجێ
لێرەکانە هەتاو نیوەی قورساییی شانمان کۆڵکێش دەکا
لێرەکانە سەربانەکان لەبەر پێی تینی نیوەڕۆدا، بە بێ هیچ
گلەیییەك
زار دەکەنەوە
سەربازان لە پێشەوەی نسێی خۆیانەوە بە ڕێگەوەن
وەکو ئەو دۆلفینانەی پێشڕەوی گەمییە رەشەکانی
ئیسکیاتووس ـ ن
ئەم جارە نسێکانیان دەبینن وەکو سیمای هەڵۆیەك کە شاپەڕی
خۆی لە هەتاوی ڕۆژاوا ئەرخەوانی دەکا، لە سەریان هەڵدەنیشێ
و
دەڕوانێتە ئەستێران
لێرەکانە لەسەر هەر دەرکەیەك نێوێك هەڵکۆڵراوە،

بەشێکیان تەمەنیان سێ هەزار ساڵە
لێرەکانە هەر گاشە بەردێك بە دیمەنی ئیماندارێك نەخشێندراوە
چاوانی ئاوێتەی تووڕەیی و ئاگرە و ئەو زولفانەی وەکو تەناف -
ن
لەسەر بازۆڵەی هەر کام لە پیاوانی ئێرە
دیمەنی فریشتەیەکی دەریاییە
هەر کام لە کچانی ئێرە، مستێ تیشی خوێن ڕەشیان پێیە لە ژێر
داوێن
لە نیهانخانەی دڵی هەر منداڵێك
پێنج شەش خاچی ناکامی بەخشێندراوە
وەکو بریسکانەوە نسێی قازە کۆچەرەکان  لەسەر لمی دوا
نیوەڕۆ بێ نیازی ئەندێشەین
ئێمە دەزانین هەموو ڕێگاکان بەرەو خۆراگریی بەرزاییەك دەڕۆن
لەوێکانە هەوا زۆر ئاشکراتر دەژی
کاتێ ڕۆژاوا لێڵ دەبێ و
تروسکەی کەپرە وشکەکانی گژ و گیا لە بەستێنەکان ئاوا دەبێ
پیرە ژنان پاڵ بە گاشە بەردەوە دەدەن و
بە چاوانیان دەریا دەڕێسن
لێرە دادەنیشن و ئەستێران دەژمێرن وەکو شتی زێڕینی
باپیرانیان
دیسان دەنیشنەوە و نەوەکانیان
تێر دەکەن بە خەڵاتی باڕووتی شاری قارەمانی میسولونگی

لە ڕاستیدا پێشەوای خاوەنی زنجیر بە تەوێڵی مۆن و چاوی
شەڕەنگێزەوە
دەستەکانی کەلەپچە کرد
وەکو خڕکەبەردێك لە سنووری دیواری خۆڵدا
ئەم شەپۆڵە یاخییە بۆ چەند ساتیش چاو ناپۆشێ
لە ناخی ئۆقیانووسەوە سەرهەڵگرتوو بەڕێوەیە
سامەکانی ئەم تۆفانە لە بەستێنی ئاسمانەوە دێن
ئاخ...
لێ گەڕێ با ئەم تۆفانە بهاژێنێ
هەتا درەختی میوەی بیرەوەری ویشك بکا
لێ گەڕێ با ئەم تۆفانە بۆ جارێکی تر لە گەڕ دابێ
هەتا بڕژێتە سەر ئەم گاشە بەردەی هەورە تریشقە
لێ گەڕێ با بۆ چەندین جار هێرش بەرێ، تا لە دەماری دارستانی
سەوڵی لیاکۆ بدا
با بە یەکەم هێزی وێرانگەری خۆی سەرەڕۆیی خاپوور بکا و
لە شەڕگەدا یەخەی ورچی شەو بگرێ و وەسەمای بخا
کاتێ تەپڵی مانگ هاوار دەکا هەیوانی دوورگەنشینان داڕێژراوە
لە دایکان و منداڵانی قەڵای قارەمان سۆلیۆ
کاتێ لە دەربەندی بەرینی بەیانییەوە قاسدێك دێ
هەتاوی نوقمی عارەقەی گۆنا لە درەوشانەوە دایە
رومیوسین بە ناسنامەی یۆنانی بوون لە بن هەنگڵیدا
وەکو کرێکارێك لە کەنیسە کڵاوەکەی دەپارێزێ

لە هەمان کاتیشدا دەڵێ:

ئاگادار بن! کاتی بڕیار گەیشتوو،

هەنووکە مڵکی ئێمە گشت کاتەکانە

٤

لەگەڵ ئازاری هەستی خەڵکە برسییەکان و

لەگەڵ بلووری ئەستێرەی نیگای راستەوخۆیان ئەوان نوقمی سپێدەی بەیانین

لە کاتێکدا لەسەر شانیان هەست بە هاوینی شووم و دڵڕەق دەکەن

سەربازان دێنە ژووریێ، ئاڵا بەدەست، بە هێرشێکی قفڵکراو

وەکو هەرمێیەکی تفتی نێوان ددانیان

بە پۆتینی تێك تەپیوەوە کە نوقمی لمی مانگە

بە گوێچکەو لووتی ئاخنراوی تۆزی قیلاویی شەوەوە

ئەوان بەرینایی زەوییان پشکنیوە

درەخت بە درەخت و بەرد بە بەرد

لەگەڵ سەرینی دڕوو خەویان بەش کردووە

بە نێوان دەستە سووتاوەکانیاندا

رووباری ژیانیان خستۆتە گەڕیان

ئەوان لە هەر هەڵمەتێکدا پەڵەیەکی ئاسمانیان گرتووەتەوە و

بە هەڵوێست لەسەر هێلکەکانیان

بوونەتە خۆڵەمێشی گاشە بەرد و جەنگەڵ

کاتێ لە شەرگەی  گوندێکدا سەمایان دەکرد
بانەکان لەرینەوە و
شووشەی شەرابی سەر تاقەکان پێکدادران
چ هاوارێك بوو دوندی شاخەکانی خستە لەرزین
ئەوان کەشەفی زێرینی مانگیان بە ئەژنۆ گرت و خواردیان
وەکو تێکقرمانی ئەسپێ لە نێوان نینۆکدا
پشتی ئازاریان شکاند بە ترپەی دڵ
کێ لەوێیە گردەنانێکی گەرمت بۆ بێنێ و
لە خواردنی خەونە خۆشەکانت دابێ لە شەودا
لەبن نسێی زەیتوون کێ ڕاوەدەستێ و
تێکەڵ بە دەنگی جیك جیکە دەبێ؟
هەنووکە مانگ دۆغابی تیشکی بە لەوەرگەی ئاسۆدا پرژاندووە
بۆ سڕینەوەی نێوەی گشت پیاوان
بەڵام نەکا جیك جیکە بە دەنگێکی کپ بخوێنێ؟
ئەم خاکەی ملکی ئێمە و ئەوان بوو
ئەم خاکەی بۆنی خۆشی سپێدەی بەیانی بوو
ئەم خاکەی هاوخوێن و رەگەزمان بوو
بۆ .. هەنووکە دەروازەی ڕەزەکانمان لێ داخراوە؟
رووناکایی بۆ لە سەربان و لقی درەختەکان ئاوابووە؟
... ... ... ...
ئەوانەی وا لە ژێر خاکدا دەژین یان
ئەوانەی بەند و زنجیریان تێدا  تێپەڕ دەبێ

کێ دەتوانێ بیدرکێنێ؟
ملیۆن ملیۆن تیشکی هەتاو سڵاوتان لێ دەکا و
ئاسمان ئاڵا رەنگینەکانی هەڵخستووە
بەم حاڵە بەشێك لە کۆت و زنجیر و ئەوانی تر لە ژێر خاکن
ئاگادار بن ڕەنگەکان هەموو کاتێ دێنە دەنگ
ئێمە خاوەنی ئەم خاکە دایکەین
لە ژێر خاکدا ئەوان بە دوو دەستی وەکو خاچ
تەنافی گازەنگیان لە چاوەڕوانی کاتی بڕیاردراودا راگرتووە
لە بێ خەوی دان و لەگەڵ مەرگ نامۆن
چاوەڕوانن بە زاری سوورەوە بانگ بدەن و
قیامەت هەستێنن
ئێمەین خاوەنی ئەم خاکە دایکە و کەس بۆی نییە

٥

لە ژێر چۆڕە چۆڕی گڕی نیوەڕۆدا
لە ژێر نسێی درەختی زەیتوون وەرکەوتوون و
لە ئەنگوستە ئەستوورەکانیان تیشکی ڕەش دەچۆڕێننەوە
ئەوان باریان خست و ژمارديان
چیها ئارەقەی لاجانگ پێویستە هەتا پڕی بکەن لە ڕێی شەو
چیها ناکامی لە تۆڵەکە ئاڵاوە و
چیها بوێری لە چاوانی ئەو کوڕە بیچکۆڵە پێخاوسە دایە
کە ئاڵای بە بەرزترین شوێن سپاردووە

لە پانتایی دەربەنددا دوایین پەڕەسێلکە ڕاوەستاوە و
لە ئاسمانەوە خۆی ئاوێزانی پایز کرد
لێرەکانە لە نێو هێلانەکانیان
بێجگە لە سەدەفی لێکترازاو چیتر ناژی
بەڵام هەروا دەسووتێ و دەبێتە سووتوو
پێشتر ئەوان لە ژێر بەردەکان ئێمەیان بەجێ هێشت
بە جلێکی کۆن و سوێندێکی نەخشینەوە
لە دەرکەیەکی وێران
ماوەمان نەبوو بمانڕوانن
تەنیا بێدەنگی پڕماناترین شت بوو
ئەویٚ، بەستێنەکانی دەریا هێشتا ڕووناك بوون
وەکو چێشتخانەی کابانی کوژراو
ئێستا ئەوان لە چ بەستێنێکدا دەبن
کاتێ باران بە ناخی خاك و گەڵا رزیوەکانی چناردا ڕۆدەچێ
چییان لێ دی
کاتێ هەتاو لە نێو پارچەیەکی سپیی هەوردا ون دەبێ
کاێ بەفر وەکو لەك لەك
لە قۆڵە کورەی شەو بئاڵێ
ئەوان چۆن بمێننەوە؟
دایکە پیرەکان خوێ بە ئاگردا دەپڕژێنن و
خۆڵ بەسەر چاودا دەبارێنن
ئەوان ڕەزەکانی مەڵبەندی مونووازیا زادگەی ریتسووس ـ یان

هەڵبڕیوە

هەتا نەکا دڵۆپێ لەو شیلە بەتامە زاری دوژمن شیرین بکا!
ئەوان ئێسکانی باوك و تفەنگەکانیان لە کۆڵ ناوە
تا لە شەوێکی دەرەوەی حەسار و لە شوێنێك
ڕەگەکان بچەقێنن
ئەو دەستانەی مەزراکانیان پاراست
لە کوێستان بوون لە کەناری دەریاکان
سەختە ڕۆژێك فەرامۆش بکرێن
ئەو دەستانەی بە شوێن گوڵی داودییەوە بوون و
شەتەك درابوونە سەر پەلا پیتکەی تفەنگ
بێگومان پێی دەچێ نان و رەنجیان وەربگرنەوە
بەیانی لە خیزەلانی بەیانیدا جووتێك سەوڵ بە دیارەوەن
تۆفان دەخرۆشێ و دەهاژێنێ
هەواڵێك لە گەمی و گەمییەوان؟
گاسن دیلی خۆڵە و با ـ دەلوورێنێ
هەواڵێك لەو پیاوەی زەوی دەکێڵێ؟
زەیتوون و رەز و کەوێڵ نوقمی تۆز و خۆڵەمێشن
ئەستێرەکانی شەوێ دێنە سەربان
گەلای وشکهەلاتووی غار و ئۆرگانۆ لەسەر تاقەی ئاگر دادەنرێن
لەو ماڵە سەنگەرەدا کتریەکی رەش هەڵگەڕاو
بە کەمێك ئاوی کولاوەوە
کوا دەرفەتێ بۆ خواردنەوە؟

لافاوی خوێن لە ڕەگی جەنگەڵەوە هەڵدەچێ
گوێ بگرن:
ئەمە ترپەی پێی ئاشنایە
کێیە بەرەو لامان ؟
زایەڵەی ئەم هەنگاوە لە کەوشی بزمار ڕێزی سەر گردێیە،
کێیە بەرەو لامان؟
دەنگێکی ئاشنا و وەڵامێك:
ئێوارەت باش کاکی برام
بەم شێوەیە تیشك
درەختەکانی خۆی و درەختی میوەی خۆی دەدۆزێتەوە
قومقومەی سەربازی مردوو هێشتا پڕە و
لە ئاسۆوە تیشکێك:
ئێوارەت باش کاکی برام، ئێوارەت باش..
پیرێژنێکی عەرەب لە گۆڕی خۆیدا وردەواڵە دەفرۆشێ
بەڵام کەس بە ئاواتی کڕین نییە
ئەوان هەموو بۆ ئاسمان هەڵفڕیون و
ئیتر لە گەڕانەوەدا بێ توانان
تەنانەت بێ توانان لە گێڕانەوەی ئەو شوێنەی پێی گەیشتوون
لە خەرمانێك
ئەو شوێنەی سەربازان شەوێك لێی حەسانەوە
لەوێکانە لە ناخی درەختی سەوڵ و چنار و بنچکی غار دا
بەردەکانی زەیتوون و

خوێنی وشکهەڵاتووی مانگ لەگەڵ
سروودی حەماسیی تفەنگەکانیان بەجێ ماوە
ڕۆژی دواتر:
چۆلەکەکان ورکەنانە بەجێماوەکانی ئەوانیان تەواو کردبوو
بەگوڵ مێخی ئەستێرە و
ئەو شەمچانەی سەربازان جگەرەیان پێ داگیرساندبوو
منداڵان لەیستۆکیان ساز کرد
ئەوان ئەو نیوەڕۆیە
لە ژێر نسێی درەختی زەیتوون دانیشتوون
بەرەو دەریا
لەسەر ئەو گابەردەی سبەی قسڵ هەڵدەگەڕێ
سبەینێیەکی تر ئێمە خانووەکانی خۆمان و
ڕێی پیرۆزی ڕزگاریمان پێ سپی کردەوە
ڕۆژانی دواتر لەو شوێنەی خەو میوانیان بوو تۆو دەچێنن و
چرۆی هەنار وەکو یەکەم تەقینەوەی پێکەنینی منداڵ
لە ئامێزی هەتاودا دەپشکوێ
لە ئاکامدا ئێمە لەوێ کۆ دەبینەوە
لاپەڕەی دڵیان هەڵدەدەینەوە و
لە دەسپێکەوە
چاو دەخشێنین بە مێژووی چیرۆکی مرۆڤەوە

٦

ئەو کاتەی هەتاو تیشك دەهاوێژێ بەسەر سیمای دەریادا
بەستێنێ بەرامبەر ڕۆژ دەشواتەوە
جارێکی تر هاواری تینوویەتی باوەش بەئاسماندا دەکا
لە زامی کۆن خوێنی نوێ دەتکێ
دڵ لە دەرگانەدا بەتینی گەرما سوور بووەتەوە
وەکو پیوازی سوورهەڵگەڕاوی ئارگیو
وەکو تێپەڕینی زەمان
وردە وردە
چاویان ڕەنگی ئاسمان دەگرێ
جام بەتاڵە لە ڕۆنی چرا
جێی بەجێمانی خڵتە و مشکی مردووە
دلێریی دایکانە و جەڕە و عەمباری ئاوەکان ویشکن
کانی هەنگوژە بەدووکەڵی باڕووت خەست و تیژ بووە
هەنووکە بۆ چرای سانتاباربارا ڕۆنی چرا لە کوێوە دێنن؟
بۆ بەر پێی پەیکەرەی زێڕینی ڕۆژئاوا گوڵی پنگە لە کوێ دێنن؟
کوا پارووە نانێ بۆ خاتوونی هەژاری ڕۆژئاوا؟
لە قەڵای ئەو پەڕی دوورگەدا
هەرمێی نوێ و سوێسنی سپی بەڕەنگی دێون
خاك کێڵدراوی شوێنی تۆپ و گۆڕەکانە
مەتەرێزە وێرانەکان و ئاسمان بوونەتە جەستەیەك

ئیتر لێرە جێی مردووی تر نابێتەوە
ئیتر دەرفەت نییە بۆ خەمینێ تا شانە بەزوڵفی دابێنێ
ئەو بالآیانەی جەرگ و ڕیخۆڵەیان هاتووەتە دەرێ
وەکو گلێنە دەرپەڕیوەکان دەڕواننە دەریای خۆڵ و
گوللەی نێو قەبرەغەی دیوار
لە مەیدانی ڕۆژدا هەتاو تەرمە رژاوەکانی سەر خاك دەدێرێ و
کاتێ هەتاو ئاوا دەبێ
سەربازان لەسەر زگ بەگابەردە تۆخەکاندا هەڵدەگەڕێن
لە گاگۆڵکەدا هەوای دەربەندی مەرگ هەڵدەمژن
لە گاگۆڵکەدا پێڵاوی مانگ دەدۆزنەوە و چەرمەکەی کاوێژ دەکەن
مست بەنێوچاوانی گاشەبەردد دەدەن
تا ئاوی یەخسیر بووی ڕزگار بکەن
بەڵام پشتەوەی گابەرد چۆڵ و هۆڵە
بۆ جارێکی تر دەبیستینەوە ناڵە و هاواری
شکاندنی سەدەفی نێو دەریا
بۆ جارێکی تر دەبیستینەوە هاواری زامدار
کە دەروازەکان دەکوتێ
بۆ کوێ دەڕۆی؟
براکەت هاوارت دەکا
شەو لە گەمارۆی مۆتەکەی پاپۆڕەکاندا نامۆیە
ڕێگاکان بەچۆڕانەوەکان بوونەتە بەنداو
تەنیا ڕێیەك بەجێ ماوە،

بەڵام بەرەو دوورترین شوێن زار دەکاتەوە
هەر بۆیە پاپۆڕەکان وەبەر شەپۆلی جنێو دەدەن و
زمان دەکرۆژن
تا تامی ژانێك بکەن کە هێشتا بەمۆخی ئێسکاندا ڕۆنەچووە
... ... ... ...
لە پشت سەنگەرەکانەوە ئەو گیان بەختکردووانەی
پارێزەری قەڵاکانن
لە زرێ کانیانەوە گۆشتی لەشیان هەڵدەوەرێ
هۆی براکەم تۆ هێشتاکە خۆڕاگری
گوللە لە دڵی تۆدا چەکەرەی کردووە
پێنج لق سونبول لە کەناری بەرددا پشکوتووە
هەر زامێکی لەشتان تەلێکە لە ئاوازی ژیان
خوێنی ئێوە هەوێنی خۆشیی بەسەرهاتە و
بەیبوون لە نێو چڵکی نینۆکی لاقتان چەکەرە دەکا و
بۆنی خۆشی دنیای ئێمە دەپرژێنن
ژیان گشت شتێکتانە، لێی حاڵیی بن
ئێوە خاوەنی دەریای بێ سنوورن
تاڵە قژێك کە هەڵدەکێشن، تالاوی لقی هەنجیری لێ دەتکێ
هەنووکە لە هەر هەناسەیەکدا ئاسمان دیداری نوێ دەکاتەوە
ئەستێرەی ئێوارە وەکو جگەرە ڕۆحی ئێوە هەڵدەپێچێ
بۆیە لە کاتی خەوتندا دەتوانن ڕۆحتان داگیرسێنن
دەستی چەپتان بە تیشکی ئەستێرە تەڕ بکەن

دەستی ڕاستتان شەتەك بدەنە تفەنگەكانتان
وەكوو ڕێك گوشینی گراوەكەتان
لە بیر مەكەن كاتێ نامەی ئاسمان لە گیرفان  دەردێنن و
بە ئەنگوستە سووتاوەكەتان تیشكی مانگ هەڵدەدەنەوە و
پیاوەتی و شەڕەف و
شانازی دەخوێننەوە
ئێوە لەبیر نەكراون
لەو كاتەوە
دەچنە ئەو پەڕی بەرزاییی دوڕگە نشینانەوە
هاوڕێ لەگەڵ نێزەكییەكان
لەبن میچی حەوشە و كۆڵەكەی پاپۆڕ و
لە بەرزاییی پۆلی كێوان
وەكو تەرمی سەربازان دەستەو یەخەی لێوەكان دەبن
تا قووڵایی تاریكیی شەویش دایان ڕمێنن
ئێوە ئەو كاتەی لە گیرفانی كۆنی ئاسمان
ئەو سینگە نەدۆزنەوە شیر بە داهاتوو بدا
جەستەی شیناییەكان وەبەر گوللە دەدەن

٧

ماڵ و كۆلان، كاكتووس، ئەو جووجەڵانەی دەنووك لە پەڵەی
هەتاوی حەوشە دەدەن
زۆر دەمێكە  ئاشنای ئێمەن

ئێمەش ناسیاویانین
لێرەکانە، لە خوارێ، لە نێو دڕووی شیلاندا ماری درەختی
کراسی زەردی خۆی فڕێ داوەتە سەر خاك
لێرەکانە هێلانەی مێروولەکان دەدۆزنەوە
نسێی بورج و دیواری قەڵای زەردەواڵەکان خۆی بەسەر
پیرە درەختی
زەیتووندا راکێشاوە:
پێستی سیسالرکەی پار بەجێ ماوە و
دەنگی جیك جیکەی ئەمساڵ دەبیستیەوە
سێبەرتان وەکو سەگێکی بێدەنگ و بە وەفا بە شوێنتانەوەیە و
نیوەڕۆیان لە کەنارتاندا بە پرخ و هۆڕ دادەنیشێ
شەوانیش لە دەم پێتان کروشمە دەکا و
چاو بە ئەستێرانەوە هەڵدەواسێ
لێرەکانە بێ دەنگیی هەرمێ گەرا دەخاتە نێوان ڕانی هاوین
ئاوێکی ماندوو و خەواڵوو
لە نێوان ڕەگی خەرنووبدا جێی خۆش کردووە
چاوانی هەڵۆیەك ئاویلکەیە و
لەو بەرزاییانە لەو پەڕی لێرەواری کاژ
نوێژگەی یۆحەننای پیرۆز لەبەر تیشکی خۆرەتاو
وەکو ڕیقنەی چۆڵەکەیەك لەسەر گەڵای پانی توو
لەبەر گەرما وشك هەڵدێ
لە نێو هەر تاڵە قژێکی ئەم شوانەی نێو قاپووت، رووبارێکی وشك

هەیە و
جەنگەڵێکی بەڕوو لە نێو گەروویدا لە گەڕ دایە
داری دەستی گریێ گرێی
وەکو یەکەم سەوڵی گەمی کە لە قووڵاییی دەربەندی داردانێلدا
نووقم بوو
پێویست نییە بۆ جارێکی دیکە بێتەوە یادت
خوێنی ئێوە ڕەگی چنارەکانی ئافراند
خوێنی ئێوە هەناسەی بە دەماری بەڕوو و سوێسنی سپیدا کرد
ئاهەنگی پیاڵە ڕەشەکان و
با ـ ی سپی لە قووڵاییی و خامۆشیی چاڵەکاندا دەشنێتەوە
ئاهەنگێك پڕ بە پیاڵەی شەڕابی کۆن،
دەنگێکی ساکار و پێشەنگ لە ڕۆژە سەرەتاییەکان
ئاسمان بە شینایی تۆخی خۆی
گاشەبەرد و چاوانی ئێمە دەشواتەوە
هەموو شەوێ شەوگەڕی مانگ
مردووە داوێن پاکەکانی شەرگە دەخاتە سەر پشت و
بە قامکی توورە و شەختەلێدراو، گۆنایان دەپشکنێ
تا لە نێو ئەم حەشاماتەدا
بۆنی قووڵاییی چەنە و
کەوانی برۆکانی کۆرپەکانی بناسێتەوە
کیژی شەوگەڕی مانگ گیرفانیان دەپشکنێ و
زۆر جار شتێك دەدۆزێتەوە

قوتوویەکی بچووك، خاچێکی لەت، جگەرەیەکی شکاو،
کلیل، نامە، سەعاتێك کە بە کاتی ٧ خەوتووە و
ئێمە بۆ جارێکی تر سەعات کۆك دەکەینەوە
سەعاتەکان دەکەونە ڕێ
ساتەکان هەر وا بەرەو پێش
سبەی کاتێ جلەکانی بەریان هەڵوەری
وەکو پارچە پارچەی ئاسمان لە نێو ئەستێراندا
یان وەکو ئەو ڕووبارانەی لە نێو بنچکی غار
یان وەکو ئەو سنوورانەی لە بەهار
لە نێوان درەختی لیمۆدا مابێتنەوە
لەشیان لە نێوان دووگمە و
زرێدا بە جێ ماوە
ئەو کات رەنگە بتوانین ناو و ڕەچەڵەکەکان بدۆزینەوە
ڕەنگە بتوانین هاوار بکەین
ئەشقی من! خۆشەویستی من!
ئەو کات ڕەنگە درەنگ بێ
وەکو ئەو دەستەی لە تاریکیدا دەیگوشن
یان ڕۆحی ئەو شاربەدەرە بێ
دوای چیها ساڵ دێتەوە بۆ نیشتمان و
تەنانەت خزمانی نزیکیش نایناسنەوە
ئەو کە چووەتە پێشوازیی مەرگ
بەڵام لە نەناسراویدا بێ ترسە

گەر واش بێ ئەو لە سبەینیکانی دیکەدا ناسیاو دەبێ
دوورترین مەودای زەمان نزیکترین ڕێی دلۆڤانە
هەنووکە کاتی ئەوە هاتووە، ئەو ولاتە لەگەڵ خۆی ببا
تاکو مانگ لەگەڵ خەمەکانی خۆی
ماچ بڕژێنێتە گۆنای و
قەوزەکانی دەریا و گوڵی شەمدانی، مێز، پلیکان، شاخ،
شار و ئاسمان
سلاو و مالاوایی پێشکەش بکەن
لەم حاڵەدا مانگ
سووتووی سیگارەکەی لەسەر دیواری هەیوان دەتەکێنێ و
لەسەر باڵنجەکەی فرمێسك دەبارێنێ
بە پێداگریی درەخت و شاهیدی برا و بوونی ئەستێرەکان.

## سووناتی مانگەشەو

(شەوێکی بەهاری ژوورێکی گەورە لە خانوویەکی کۆندا. ژنێکی پیری ڕەشپۆش لەگەڵ گەنجە پیاوێك دەدوێ. ئەوان چرایان هەڵنەکردووە. مانگەشەوێکی بێ قەرار بە دوو پەنجەرەدا دێتە ژووریێ. لە بیرم چوو بڵێم کە ژنەکە دوو یان سێ کۆمەڵە شیعری سەرنجڕاکێشی لە چاپ داوە کە هەناسەی ئاینییان پێوەیە. ژنە ڕەشپۆشەکە لەگەڵ گەنجەکە دەدوێ:)

لێ گەڕێن با هاوڕێتان بم. چ مانگەشەوێکە ئەو شەو!

مانگە شەو باشە - وێ ناچێ

قژم سپی هەڵگەڕابێ.

دیسانەوە مانگترووسکەی زێڕینی بە زولفم دادەکا. ئێوە

هەست بە بوونی ناکەن.

لێ گەڕێن با هاوڕێتان بم

کاتێ مانگە شەوە، نسێکانی ماڵێ پێ دەگرن

دەستی نادیار پەردەکان لادەدا

لەسەر پیانۆ ئەنگوستێکی ڕەنگ پەڕیو

وشەگەلێکی لەبیرکراو تۆمار دەکا - نامەوێ بیانبیستم

وست بن!

تا کەمێك ئەولاتر، لێ گەڕێن

بە هاوڕێتان بم

تا نزیك كارخانەی شەمچە
تا شوێنی وەرسووڕانی كۆڵان.
شاری ئەستەم و سیمانیی دۆغاب پێداكراو
وەكو ئەوپەڕی سروشت
سەربزێو ڕۆحانی خۆی دەنوێنێ
ڕەنگە لە ئاكامی باوەڕی بوون یان نەبوون دابین
كە قەت نەبووین و
زەمان هەرگیز ڕزانی بوونیانی نەپێواوە
لێ گەڕێن با هاوڕێتان بم
بۆ ساتێ لەسەر كورسییە بەردینەكەی سەرگردێ دادەنیشین
گەر بای بەهاری بەسەرماندا دەشنێتەوە
ڕەنگە ئاوێتەی هەڵفڕینێكی خەیاڵی بین
بۆیە، لە هەزاران جاری هەنووكە
وەكو شەقەی دووباڵی بەهێز لە كاتی فڕیندا
دەنگی كراسەكەمم هاتووەتە گوێ
كاتێ مرۆڤ دیلی ئەم هاتوهاوارەی فڕینە
وا هەست دەكا كە گەرووی وێكدێ
هەر بەم چەشنە گوێ و پەراسووی لە نێو ماسوولكەی هەوای شین و
دەماری بەهێزی بەرزاییەكان ڕێك گوشراوە
گرینگ نییە مرۆڤ بگاتە مزڵ یان وەڕێ بكەوێ
گرینگ نییە مرۆڤ قژی سپیی هەبێ
ئەمە ژانی من نییە.

بەڵکو دڵم نایەوێ سپی هەڵگەڕێ)
لێ گەڕێن با هاوڕێتان بم
باش دەزانم هەرکەسێ تەنیا لە رێی عەشقدایە
تەنیا بەرەو شانازییە
تەنیا بەرەو مەرگەوەیە
پێی دەزانم، تامیم کردووە، چ بێ کەڵکە
لێ گەڕێن با هاوڕێتان بم
... ... ... ...
ئەم ماڵە دەستبەسەرە وە خۆم ناگرێ ـ
دەمەوێ بڵێم هێندە کۆنە، بزمارەکان بەرگە ناگرن
تابلۆکان دێنە خوارێ
دەڵێی لە پانتایی بەتاڵدا نوقم دەبن
گەچەکان کپ بەردەبنەوە
وەکو بەربوونەوەی کڵاوی مردوویەك لە رەختاوێز (حەلاقە)ی نێو رێڕوی تاریکدا
وەکو خزینی دەستکێشی کۆنەی بێ دەنگی لەسەر ئەژنۆی یان
وەکو هەڵدێرانی پەڵەیەك لە مانگە شەو هەتا سەر کورسی نیانی
شڕ و پەتۆر
سەردەمایەك ئەویش گەنج بوو ـ نا،
لەو تابلۆیە نادوێم لە بێ متمانەیی چاوت دایە
بەڵکو لە کورسییەکی نیان کە لە ئاسوودەییدا
دەمانتوانی دانیشتنی تێدا بەسەر ببەین و

بە چاو لەسەر یەکدانان لە ئەندێشەی هەموو شتێك دابین :
ـ لمستانێکی تەڕ و ترووسکەدار لە مانگە شەو
ترووسکەدارتر لەو پێڵاوەی مانگێ جارێ دەیبەمە لای بۆیاخچی
ئەو سەری کۆڵان
یان
بایەوانی پاپۆڕی ماسیگرێك کە لە لاواندنەوەی هەناسەی خۆی
لە شوێنێکی دووردا
سست دەبێ بایەوانی سێ سووچ، وەکو دەسرەیەکی دوولۆکراو
دەڵێی بەتاڵە لە هەرشتێکی کە هەڵیبگرێ یان
بیپارێزێ یان
تەواو ئاوالا بۆ ماڵئاوایی لە شەکانەوەدا بێ
دایمە زەبرم لە دەسرەوە لێکەوتووە
بۆ ئەوە نییە هەرچی ڕوو بدا
تووی گوڵ یان کامووەمی تێدا بپارێزم کە بەیانی لە
دەشتەکاندا چندراون یان
وەکو کلاوی سەری کرێکارانی دەزگای بەرامبەر
چوار گرێی لێ بدەم یان
چاوم بسڕم ـ هەرگیز چاویلکەم لێ نەداوە
چاوانم باش ماون.
دەسرە هەوەسێکی سانایە
هەنووکە چوار قەدی دەکەم، هەشت، شازدە
ئەمە بۆ سەرقاڵکردنی دەستەکانمە

هەر ئێستا لەو یادەدام کاتێ
بە بەرهەڵبێنەی شین و یەخەی سپی
بە دوو پەلکەی زێڕینەوە
بەرەو کۆنسێرواتوار دەکەوتمە ڕێ
هەر بەم چەشنە لە پێوانی هەنگاوەکانی مۆسیقا دابووم
- هەشت، شازدە، سیودوو، شەست و چوار -
لە درەختی هەڵووی دۆستی ڕازاوە بە تیشك و شکۆفەی گوڵ
لقێکی بچووکم بە دەستەوە بوو
(ئەو وشانەم لێ ببوورن، عادەتێکی باش نییە) -
سی و دوو، شەست و چوار
دایك و بابم هیوادار بوون بەو مۆسیقایەی لە زاتی مندا بوو
بەڵێ، بۆ ئێوە لە کورسیی نیان دەدوام - کورسیی شڕ و پەتۆر
فەنەری ژەنگاوی و حەسیری تێدا دەبیندرێ
بەخۆم دەگوت دەیبەمە لای مۆبل سازی بەرامبەرمان
بەڵام ئەی بۆ ماوەی و پارەی و هەست - دەبێ دەستێکی بەسەر
دابێ، بەڵام
لە کوێوە دەست پێ بکەم؟
بەخۆم دەگوت بە پارچەیەك دای دەپۆشم - لەم مانگەشەوەدا
پارچەی سپی دەمترسێنێ
لێرەکانە کەسانێك دانیشتوون،
وەکو ئێوەو من
خەون و خەیاڵی گەورەیان بوو

هەنووکە بەبێ ئەوەی باران یان مانگ ئازاریان بدا
لە خەوی ژێر خاکدان
لێ گەڕێن با هاوڕێتان بم
... ... ... ...
لە سەرەوەی پلیکانی مەڕمەڕینی سێن نیکۆلا
بۆ چەند ساتێکی کورت ڕادەوەستین
دواتر ئێوە،
لەو درزەوە دەچنە خوارێ و من دەگەڕێمەوە
نەرمونیانیی کۆتی ئێوە لە شانی چەپمدا کە لە ناکاو لێم درا
رووناکیی چوارگۆشەی دەلاقە بچووکەکانی گەڕەك و
هەمووی ئەم بووغە سپییانەی مانگ دەپارێزم کە
لە خێڵی بەرینی قووە زێوینەکان دەچن
ـ لە کارکردنی وەها ڕستەیەك من ناترسم
بۆیە لە هەزاران جاری ڕابوردوو
لە شەوە بەهارییەکاندا لەگەڵ خوداوەند دەدوام کە
لە مژ و شانازیی وەها مانگە شەوێکدا مێوانم بوو
هەزاران گەنجی جوانتر لە ئێوەم بۆ قوربانی کردووە
لە گڕی سپیمدا دەبوومە بوغێکی سپی
لە مانگە شەوی سپیدا دەست پێ نەگەیشتوو بووم
چاوچنۆکی پیاوان و سەرنجڕاکێشیی لێڵی لاوان لە مندا
گڕی دەئایساند
لە بازنە ڕێزدارەکاندا بووم

ئەو تەرمانەی خەرمانەئاسا بوون
لەشیان بە مەلە، سەوڵ لێدان، کایەی مەیدانی و تۆپێن
ئامادە بەهێز بوو
(وام دەنواند قەت نایانبینم)
تەوێڵەکان، لێوەکان، گەردن، ئەژنۆ، ئەنگوست، چاو
بەرۆك بازوڵە و ڕان (بەڕاستیی نەمدەدیتن)
دەزانن، کاتێ ڕێزدانان، مرۆڤ خۆی لە شتێکدا لەبیر دەباتەوە
کە ڕێزی بۆ دادەنێن
ئەو ڕێزە بۆ مرۆڤ بەسە.
خوایە چ چاوانێکی گەشن
من لە نێو ڕیزی ئەستێرانێکدا کە
نەمویستبوون، بالاّم دەکرد
بۆیە کاتێ بەم چەشنە لە ژوورێ و دەرەوە، گەمارۆ دەدرام
غەیری سەرێ و خوارێ، هیچ ڕێیەك بەدی نەدەکرا
نا، بۆم بەس نییە
لێ گەڕێن با هاوڕێتان بم
دەزانم وەختە، دە لێ گەڕێن
چیها ساڵ و ڕۆژ و مانگ و نیوەڕۆی ئەرخەوانیم
لە تەنیاییدا تێپەڕ کردووە
پێخەفێ، تەنیا، بێخەوش
تەنانەت لە پێخەفی ژن و مێردایەتیدا
بێ خەوش و تەنیا

لەسەر ئەژنۆی خوداوەند لە لە هۆنینەوە شیعری پرشانازیدا بووم
شیعر گەلێك
دەڵێی مەرمەرێکی تەواو تاشراون
لەوپەڕی ژیانی من و تۆدا، زۆر دوورتر لەمانەوە دان،
ئەمە بەس نییە
لێ گەڕێن با هاوڕێتان بم
ئیتر ئەم ماڵە ناتوانێ وەخۆم بگرێ
من ناتوانم کۆڵکێشی بکەم
دایمە دەبێ چاودێر بن چاودێر
قەفەزەی گەورە بۆ پاڵپشتی دیوار هەڵپەسێرن
مێزی کۆنی نەخشێندراو با پاڵپشتی قەفەزە بێ
کورسییەکان بۆ یارمەتیی مێز دابنرێن
ئێوەش دەست بە کورسییەکانەوە بگرن
شان بدەنە بەر دەرکەیەك کە ترازاوە
پیانۆ داخراوە وەکو تابووتێکی ڕەش
کەس ناوێرێ بیکاتەوە
دایمە وریا بن نەکەون
با .. کەس نەکەوێ
ئیتر ناتوانم
لێ گەڕێن با هاوڕێتان بم
ئەم ماڵە بەم هەمووە مردووەوە نایەوێ بمرێ
دەخوازێ لەگەڵ ژیانی تەرمەکانی بێ

بەشداری ژیانی مردووەکانی بێ

لە حەتمی بوونی مەرگی ژیان وەردەگرێ

لەسەر پێخەف و قەفەزەوە

بەسەر لەناو چووندا دەڕوانێ

تەرمەکانی لە خەو بکا

لێ گەڕێن با هاوڕێتان بم

لێرەکانە

لە نێو مژی شەوانەدا هەرچەند هەنگاوی نەرم هەڵگرم

هەرچەند نەعلم لەپێ دابێ یان

پێخاوس بم

شتێك دەنگی لێوە دێ - چرژانی شووشە یان ئاوێنە

ترپەی هەنگاو دێتە گوێ - ئەمە دەنگی پێی من نییە

لە دەرێ، لە کۆڵان

ڕەنگە هیچ گوێیەك هەست بە ترپەی ئەم پێیە نەکا

دەڵێن پەشیمانیی پێڵاوی چێویی لە پێ دایە

گەر مرۆڤ سەر وەرسووڕێنێ و چاو لەم ئاوێنەیە یان ئەوی تر بکا

لە توێی تۆز و چرژاندا

تاریکتر و ڕەنگ پەڕیوتر هەست بە سیمای خۆی دەکا

سیمایەك کە مرۆڤ لە ماوەی ژیانی خۆی

چی بۆ نەخواستووە

مەگەر پاك و پەیوەست بپارێزێ

لە مانگە شەودا لێواری ئەم جامە
وەکو تیخێك لە درەوشانەوە دایە ـ چۆنی لێو پێ ئاشنا کەم
گەر تینووش بم، چۆن لێوی تێ هەڵبسوێم؟ ـ چاوتان لێیە؟
ئێستاش من خاوەنی هەستی وێچوونم ـ هەر ئەوەیە کە بۆم
ماوەتەوە
هەنووکەش هەر ئەوە بڕوای بوونم پێ دەدا
لێ گەڕێن با هاوڕێتان بم
... .... .... ...
جاری وایە لە کاتی ئاوابووندا هەست دەکەم
ورچ باز بە پەنای پەنجەرەکاندا تێپەڕ دەبێ
دڕك و داڵ بە خوری ورچەوەیە
قورس دەڕوا
لە کۆڵاندا تۆز دەکا
تەمێك لە تۆز و خۆڵی نزم ئاوابوونی هەتاو دەپەرستێ
منداڵان بۆ شام هاتوونەوە ماڵێ و ئیتر ئیزنیان نییە
بڕۆنە دەرێ
هەرچەند لە پشت دیوارەوە لە گومانی ناسینەوەی
دەنگی پێی ورچی پیر دان
ورچی ماندوو بێ ئەوەی هۆ و مەبەستێك بەدی بکا
لەگەڵ زانستی تەنیاییی خۆی رێ دەپێوێ
لە هیلاکیدا ئیتر ناتوانێ سەما بکا
ئیتر ناتوانێ بۆ کایەی منداڵان ، بێکاران و

مرۆڤە لەخۆباییەکان کڵاوی تۆڕی لەسەر بکا
زۆر بەتامە بۆ ئەو لەسەر عەرزی ڕاکشان
تاکو زگی بخەنە ژێر پێ
ئاوا دوایین یاری ئەنجام بدا
هێزێکی سەرسامی ماڵاوایی لە ئارەزووی خۆی بنوێنێ
سەر بزێوی لە سوودی خەڵك و ئەڵقەی لێو و
ویستی ددان
سەر بزێوی لە ژان و ژیان
بە مەسڵەتی باوەڕ پێکراوی مەرگ ـ تەنانەت مەرگێکی بەکاوەخۆ ـ
دوایین سەربزێوی لە مەرگ
بە مانەوە و مانی ژیان نیشان بدات
کە بە تێگەیین و ئەڵقە بە گوێی کردن زاڵ دەبێ
بەڵام کێ دەتوانێ تا کۆتایی ئەم یارییە بمێنێ
ورچ هەڵدەستێ و دەکەوێتە ڕێ
لە ژێر فەرمانی پاڵوو، ئەڵقەی لێو و ددانی دایە
بە لێوی کونەوە بزە لەو قروشانەوە وەردەگرێ کە
بە دەستی منداڵێکی جوان و بێ نیگەران فڕێ دەدرێن
(منداڵان تایبەتی ئەو جوانییەن کە بێ نیگەرانن) و
دەڵێ سپاس،
چونکە ورچە پیرەکان تەنیا لە توانای ئەم وتەیەدان
سپاس، سپاس
ئەوان تەنیا ئەوە فێر بوون..

لێ گەڕێن با هاوڕێتان بم
ئەم ماڵە دەمخنکێنێ، بە تایبەت چێشتخانەکەی
وەکو بنی دەریایە
قۆریی قاوەی هەڵواسراو بە دیوارەوە
وەکو چاوی گەورەی ماسییە شووشەییەکان دەدرەوشێتەوە
قاپەکان وەکو شتی سەر سووڕهێنەر
لە لەرینەوەیەکی هێوردان
گیانی نێو ئاو و سەدەفەکان بە قژمەوە دەنووسێن ـ دواتر ناتوانم
لێیان بکەمەوە ـ
ناتوانم تێ بگەم
کەشەفی نێو دەستم کپ بەردەبێتەوە ـ من بەردەبمەوە
بلۆقی هەوای سینگم دەبینم کە دەچنە سەرێ و
سەرتر
دەمەوێ سەرقاڵی بینینی ئەم هەڵگەڕانە بم
لەخۆم دەپرسم گەر کەسێ لەو سەرە بێ و ئەم بلۆقانە ببینێ
دەڵێ:
کەسێك لە نقومبووندایە یان
مەلەوانێك ناخی دەریا دەپشکنێ؟
بەڕاستی زۆر جاران لەوێکانە لە ناخی خنکاندا
مەرجان، گەوهەر، خەزێنەی پاپۆڕە نوقمبووەکان،
دیواری چاوەڕوان نەکراوی، دوێنێ، ئەمرۆ، داهاتوو و
سەلماندنی تاهەتایی دەدۆزمەوە

چەشنێك هەناسەی نوێكردنەوە
چەشنێك بزەی تاهەتایی، دەڵێن
چەشنێك بەختەوەری و مەستی،
تەنانەت چەشنێك زرووقانەوە
مەرجان، گەوهەر و مرواری
تەنیا ئەوە ناتوانم بیانبەخشم ـ نا .. دەیانبەخشم ـ
بەڵام بڵێی ڕاو بكرێن ـ هەرچۆنێ بێ بەختیان دەكەم
لێ گەڕێن با هاوڕێتان بم
بۆ ساتێك، ماوەیەك بۆ هەڵگرتنی كورتەكەكەم
لە بێ بەقای ئەم هەوایەدا مرۆڤ سەرجەم دەبێ وریا بێ
شەوانە هەوا شێدارە
بەڕاستی فێنك كردنەوەی هەوا بە هۆی مانگەوە ئەندێشە ناكەن؟
لێ گەڕێن با دوگمەی كراسەكەم داخەم
ـ چ بەهێزە بەرۆكتان ـ
چ مانگەشەوێكی ورشەدارە ـ دەڵێم كورسیی نیان ـ كاتێ
ناڵبەكیی
سەر مێز هەڵدەگرم
لە ژێریدا ڕۆچینێك لە بێ دەنگی بەجێ دەمێنێ،
خێرا دەستی لەسەر دادەنێم
هەتا نەیڕوانم
ـ دیسان ناڵبەكییەكە دادەنێمەوە سەر جێی خۆی و
مانگ ڕۆچینێكە لەسەر مەڵاشووی دنیا

چاوی لێ مەکە، مەیڕوانن
هێزێکی میگناتیسییە کە بەرەو خۆیتان ڕادەکێشێ چاوی
لێ مەکە
مەیڕوانن
گوێم بدەنێ، لەگەڵ ئێوەمە ـ ڕۆدەچن
ئەم سەرەگێژە جوانە،
هەنووکە سووك تێی دەکەون ـ
مانگەشەو چاڵێکە لە مەڕ
تێیدا نسێ، باڵ و هاواری ڕەمزاویی لەگەڕ دایە ـ هەست پێ ناکەن؟
قووڵ، بەربوونەوەی قووڵ
قووڵ، چوونە سەریی قووڵ
لە نێو باڵەکانیدا پەیکەرەی مەڕمەڕ بە پێوەیە،
قووڵ، چاکە کاری بێدەنگیی قووڵ.. ئارام نابێ!
چرای لەرزۆکی بەستنێکی تر
دەڵێی لە لەرزینەوەی شەپۆلی خۆیدایە
هەناسەی ئۆقیانووس،
ئەم سەرەگێژەیە جوان و سووکە
ـ وریا بن هەنووکە ڕۆدەچن.. مەمڕوانن،
من خاوەنی شوێنی لەرینەوەم ـ باشترین سەرەگێژە ـ
ئاوا.. هەموو شەوێ
کەمێ ژانە سەر و مەنگیی جۆراوجۆر هەیە
زۆر جار بۆ کڕینی ئاسپرینێك دەچمە دەواخانەی ئەوبەر

زۆر جار بێدەرەتان لەگەڵ ژانەسەرم دەمێنمەوە
گوێ دەسپێرم بە هەڵلا و بگرەی بۆشی لوولەی نێو دیوارەکان
یان لە کاتی دەمکردنی قاوەدا
هەر بەو چەشنەی شوێنێکی تر ئەندێشە دەکەم
خۆم لە بیر نابێ و دوو ناڵبەکی قاوە تێ دەکەم ـ کێ ئەوی تر دەخواتەوە؟
پێ دەکەنم ، وەلای دەنێم سارد بێتەوە
جاری واشە دەیخۆمەوە و لەو حاڵە لە نێو پەنجەرە دا
دەڕوانمە چرای سەوزی دەواخانە
وەکو فانووسی سەوزی قەتارێکی کپ وایە
دێت و من لەگەڵ خۆی دەبا
لەگەڵ دەسرە و پێڵاوە نەخشێندراو و جانتای ڕەش و شیعرەکانم
تەنانەت بە بێ مجرییەك بۆ چیمە؟
دەڕۆن؟ شەو خۆش. من نایەم. شەوتان خۆش
دوای ماوەیەکی تر دەڕۆم
سپاس...
چونکە پێویستە
لەم ماڵە بچووکە بچمە دەرێ
پێویستە بچمە دیداری شار
ـ نا، نا، مانگ نا ـ
شاری دەست قەڵشیو، شاری هەقدەستەکان

شارێك كە بە نێو و نانی خۆیەوە سوێند دەخوا
شارێك كە ئێمە، هەمووومان
لەگەڵ سووكایەتییەكانمان، شوورەییەكانمان، ڕقەكانمان،
نەزانییەكانمان..
گشت پیرییەكانمان كۆڵكێش دەكا
... ... ... ... ...
.. ... .... ...
ئیتر نامەوێ ئاهەنگی هەنگاوی تۆ ببیستم
نامەوێ ترپەی پێی خوداوەند و خۆم
پێویستە گوێم لە دەنگی بەر فرەهی هەنگاوەكانی شار بێ

## شەوتان خۆش

(ژوورەکـە تـاریك دەبـێ. وادیـارە هــەورێك مـانگی داپۆشیوە. وێ دەچـی دەستـێك لـە نـاکـاو دەنـگی رادیـۆی بـڵـنـد کردبێ. پـارچـە مۆسیقایەکی زۆر نەناسراو دێتە گوێ. ئەم کاتە پێ دەزانم ئەمە سووناتی مانگە شەو ە کە بەشێوەیەکی نادیار هاوڕێی تەواوی بەشی یەکەمی ئەم پەردەیە بووە. لەم کاتەدا دەبێ کوڕە گەنجەکە بە کەلێنەکەدا بێتە خوارێ و بزەیەکی تەوساوی و ڕەنگە ئاوێتەی شەرم لەسەر لێوی ڕێکوپێکی بێ و هەست بە ئازادی بکا. کاتێ بە قەد نیکۆلای لێ بێ. پێش ئەوەی بە پلیکانی مەڕمەڕی دا بێتە خوارێ، پێ دەکەنێ ـ قاقایەك، بێ ئەوەی بتوانێ خۆی ڕابگرێ. دەنگی پێکەنینەکەی لە مانگەشەودا ئاهەنگی هەیە. تەنیا شتێکی ڕەنگە بێ ئاهەنگ بێ ئەوەیە کە پێکەنینەکە بێ ئاهەنگ نەبێ. دواتر بێدەنگی دادەسەپێ و دەڵێ نزم بوونی سەردەمە، تەواو هێدی بۆوە، دیسان دوگمەی کراسەکەی دەکاتەوە و وەڕێ دەکەوێ. بەڵام نازانم ژنە ڕەشپۆشەکە لە ماڵێ دەچێتە دەرێ یان نا، لە قوژبنی ژوورێدا نسێکان بەهۆی شوومییەکی تاقەت پڕووکێنەوە وێك دێن. ئەو تووڕەیییە تاڕادەیەك بۆ ژیان نابێ، بەڵکو لە بەر هیچ.. دان پێدانانە بە تاوان، دەیبیستن؟)

(دەنگی *رادیۆ* درێژەی دەبێ...)

## دوایین وتە

ئەو گوتی:
بە باشی یادم بکەن
بە هەنگاوم هەزاران مەودام پێواوە
بێ نان و ئاو درك و داڵی ڕێگام تێپەڕ کرد
تا نان و ئاو و گوڵی سوورتان بۆ بێنم
هەموو کاتی من وەفادارە بۆ جوانی
هەموو شتێکم بەخت کردووە و لە هەنووکەدا هەژارم
تەماویترین شەوەکانم
بە تیشکی سوێسنێکی بچووك دێراوە
بە باشی یادم بکەن
وەدیهاتنی دوایین حەسرەتم پێ ببەخشنەوە
دەمەوێ بە داسی تیژی مانگ
گەرمەشانی بدروومەوە
لە نێو دەرکەدا ڕادەوەستم
بە گوڵە گەنمێکی ناسك لە نێو ددان و
بەو تەماشایەی ڕۆم کردووەتە سەر دەستەکانم
دەیپەرستم
ئەو کەسەی لە بارانی زێڕینی ئاوابووندا
بە پینەیەکی ئەرخەوانیی سەر بازۆڵەی چەپی

له گردێك سەر دەكەوێت و

بە ئاسانی نابینرێ

ئەمەش ڕەنگە باشترین یادكردنەوە بێ لە من و

لە یادتان بێ.ئاوێتەبوونی كابووس و ڕاستەقینە

# ناوەڕۆك